نیکۆلای خایتۆڤ



نەڤاد عەزیز سوارە
کردوویە بە کوردی

---

چاپخانەی «الحوادث»
بەغدا ١٩٨٣

# پێش خەبەر

نووسەری ئەم چیرۆکانە ( نیکۆلای خایتۆف ) خەڵکی وڵاتی بولگارستانی‌یە ، ساڵی ١٩١٩ی بوونی لە گوندی ( یارقرۆف )ی سەر بە ناوچەی ( بلۆفدیف ) لە دایك بووە • پلەی خوێندنی : زانکۆی ( سۆفیا - کۆلیجی کشت و کاڵ )ی تەواو کردووە و ماوەیێکی زۆریش ئەندازیاری کشت‌وکاڵ بووە•

خاتیۆف دوای قۆناخی لاوێتی چالاکی ئەدەبی نواندووە ، یەکەم بەرهەمی ( ١٩٦٥ )بڵاو کردۆتەوە • کۆمەڵێ بەرهەمیشی بەدوای ئەم بەرهەمەدا بڵاوکردۆتەوە • تەنانەت کۆمەڵە چیرۆکی ( چیرۆکە دڕندەکان )ی کە لە ساڵی ١٩٦٧دا بڵاوکردەوە بە چاکترین بەخشانی بولگاری دەژمێردرێ •

بەرهەمەکانی خایتۆف ئاوێنەی بێ گەردن ، وێنەی ژیان‌و گوزەرانی خەڵکی سادەو دڵپاکی وڵاتەکەی تێدا رەنگ دەداتەوە:

ئەوانەی کە لەگەڵ سادەیشیاندا لە بەرابەر چارەنووسێکی نادیار دان .. چونکە هەرگیز فێر نەبوونو ناتوانن سەرچاوەی سۆزو خۆشەویستیان بگرن ، منالی ئەم سرووشتە بەربەرەڵلایەنو وێنەی ئەو رەگو ریشانەن کە خایتۆف لەم چیرۆکانەیدا باسیان دەکا .. چوونەتە قولای خاکو لەگەڵ سرووشتە پاك دا تێکەڵبوون، مرۆڤی چاونەترسو سەربەرزن، رمنو ناچنە جەواڵ .. هەمیشە خەنجەریان لەبەر پشتێ دایە ... بەلام زاڵم نینو زوڵم ناکەن ، بەلای ئەوانەوە ئازایەتی سەرپشکی هەموو شتێکە ، ( ئازایەتی ) بە هەموو مانایێ کە ئەم وشەیە هەڵی دەگرێ. هەر بۆیەشە کە دەڵێن : ( لەوانەیە هەرچی چاکەیە ئەوە بکەی ، بەلام تۆ دەترسی ، کەواتە تۆ زەلیلی ، تا دونیاش ماوە بە زەلیلی دەمێنیەوە . ) .

بەم جۆرە خایتۆف ئەو پاڵەوانانەمان پێشکەش دەکا کە هەموو ئەرکو ئازارو ژانی مرۆڤایەتیان داوەتە کۆڵ ، نموونەشیان ئەوەندە زۆرە وەك خیزو خۆڵ وان ..

ئاواتەخوازم توانیبێتم دونیای خایتۆڤ بە خوێنەری کورد رابگەیێنم .

**نەژاد عزیز سورمێ**

هەولێر ١٩٨٢/٣/٣

# کاتیرین

سەگێکی جەربەزەمان هەبوو پێمان دەگوت ! کاتیـرین ) خووی بە راونانی گورگانەوە گرتبوو ، دەنگی رەشەبایێك بوو بۆ خۆی ، کە دەوەری ، حەو •• حەو ، دارستان دەلەرزیو دەنگی دەدایەوە ••

مل ئەستوورو خۆشبەزو گوێ قولاخ بوو وەکو بلێی قەت نەنوێ ، دیسان وای ئەگەر کلکت دەدی ، چ کلکێـکی بادراوی بەگەوەی هەبوو • سەگێکی تابلێی چاك بوو ، بەلام مام (باچۆلا) تەواوی تێر نـەدەکرد لـە سەرەکـۆزەو پـووش زیاتـر چیـتری نەدەدایێ ••

چەندجارم پێوت : نەختێ ئـاردی گەنمەشامیم بـدێ بۆی تێکەڵ بکەم ، رەزیل بوو دەیگوت باشە بەلام نەیشیدەدا •

پێنج شەش ساڵ بوو لەگەڵ کاتیرین بزنەگەلمان دەلەوەڕاند..
متمانەی تەواوم پێ‌بـوو ، دەهاتمەوە نـاو کـۆلێتیی ، چیـلکەدارم کۆدەکردنەوەو لەئاگردانم دەنان‌و ئاگـرم دەکردەوەو ، پێم‌دەدانـە بەرێ .. دەتدی وەنەوز دەیبردمەوە ...

من دەزانم کاتیـرین جێی‌خۆی گرتـووەو ڕێی گـورگان نادا نزیك ببنـەوە ، خۆ ئەگـەر شتێـکی وایشـں بوو ئـەوا ئاگادارم دەکاتەوە .. ئەمەش شتێکی جوان‌بوو بەڵام چی‌قەوما ؟

ئەو ڕۆژە ، یا بابڵێین ئەو بەیانی‌یە کەلەخەو ڕابووم بزنەبەڵەکێکم نەدی ، دیسان ( کاتیرین ) یشم بەرچاو نەکـەوت .. سـەیرە ؟ ! !
چی‌ڕوویداوە ؟ دوای تۆزێ تەماشا دەکەم دەگەڕێتەوەو بەتەنێ‌یە بە شوێنیدا چووم بزنەردێن سپی‌یەکەم دۆزیەوە بەڵام چۆنم دیتەوە؟ گورگ کەل‌وپەلی کردبوو ! کاتیرین ڕاوی نابوون بەڵام پاشی‌چی؟ ئەوان کاری خۆیان کردبوو .. .

دەم‌و قەپۆزی خوێناوی بوو ، ئەمەش وادەگەێنێ کە تێـان بەربووە ، شتێك‌هەبوو کە لەلای من ڕوون‌نەبوو ئەویش ئەوەبوو داخۆ بۆچی نەوەڕی گوێم‌لێ‌بێ‌و خەبەرم‌بێتەوە .
بەرامبەرمان بەردەڵانێکە ، هـەر بـەردی کەرتـە شاخێکـە بۆخۆی ، ئەمەش دەنگدانـەوە زل‌تر دەکا ، ئـەگەر بڵێن دەنـگی خۆیم نەبیستووە . بۆچی گوێم لێ‌ی‌نەبوو ؟ لەبەرخۆمەوە وتـم :
( دیارە کەئەمە ڕوویداوە من لەخەوێکی قووڵ‌دابووم ) .

رۆژێ ( دیسان هەر رۆژێکی پایزبوو ) ، تەمێکی چڕوشێدار دای گرتبووو هەر بەرزدەبووەوەو نەدەبووەوە تاکو دادەکشایەوە •• وەختی گورگانە •• گورگ ئەو وەختــەیان لەهەمــوو وەختــان پێ خۆشترە کەخۆ لەنێو تەمو تاریکیدا وەشارن• ئەولەعنەتیەش منی بەنێچیر هەڵبژاردبوو •• بزنێك کەوتە ماعەماع ، منیشــ هــاوارم کرد•• کاتیرین راپەڕین‌و وەڕینی یەك‌بوو ، کەوتە دوای گورگی، هەندەی نەبرد بەدەمو قەپۆزی بەخوێنەوە گەڕایەوە ، چ سۆراخی بزنەکەیش دیارنەبوو ، لەریخۆلەش بەدەر چیدیم لەنێو دۆڵەکەدا نەدۆزیەوە •• دەمو قــەپۆزی خوێناویش خســتمیە گومانــەوە ، ئەوەدەگەێنێ کەسەگەکە بــەگژ گورگ‌دا چووەو پــڕی‌داوەتێ ، ئەوەتا دەم‌وقەپۆزیشی لەخوێنی گورگ خەڵتانە مەگەروانی‌یــە ؟ ، بەڵام کەبیرم لێ‌کردەوە : باشەئەگەر راست‌بێ تێك بەربووبن • داخۆ گورگ کاتی ئەوەی هەبووە ئاوا بە رەحــەتی چنــگی‌تێ‌بنێ بەجۆرێك لەیخۆڵەکانی زیاتر نەمێنێ ؟ خــۆئەگەر شــەڕێکیشــ بوواپە ئەوا سەگ‌وەڕێ هەر دەبیســترا ، منیشــ نەســەگ‌وەڕو نەدەنگی‌دیم بیست •• تۆبڵێی خرتــەخرتی ئێســقانی بزنەکــە کەگورگ دەیهاڕی بگاتە گوێ ، بەڵام سەگ‌وەر نەبیسترێ ••• ئەمەیان کە مەحاڵە •• ! •

گومانم‌زیاتربوو •• وتم : چاوەڕوان‌دەبم‌و خۆمی بۆ لەبۆسە دەنێم داخۆ لێرەوە بەدوا کاتیرین چ دەکا •• شتێکی تریش سەرنجی راکێشام : پێشان سەگەکە کلکی قەف‌قەف دەکرد ، بەڵام ئێســـتا

ئەوەتا لەئاستی پشتی‌یەوە درێژ بووەتەوە • ئەمەیان گـەزێ •••
گەزی دووەمیش ئەوە بـوو کە سـەگی کەللەبـۆرە وای‌لێ‌هات
بن‌بێژینگ‌و سەرکوزەرەی دەدرایێ ، بۆنی‌دەکردو پەرش‌و بلاوی
دەکردەوەو بەپێ‌یان دەی‌شێلا ئەمەش مانای‌وایە کەتێرەو نایـەوێ
بیخوا ••

ماوەیێ رابرد ، ئەوەتا جارێکی‌تر گورگ بەدیار کەوتنەوە ••

دەستم دایە دارێـك ( بێ قیمـەتانە قـەڵەوترین کـووزریان
هەڵبژاردبوو ، رفاندیان ) ، بەڵێ رفاندیان‌و بـەدوایی خۆیشـیان
راکـێشا ، ( کاتیرین ) یش بەدوایانەوەیە •••

چاوەڕێ نەبووم تاکو دەگەڕێتـەوە •• بەدوایانـدا چـووم ،
سەرکەوتم تاگەیشتمە لوتکە ، تەلانێکی دەپێشـدا بـوو ، ئینجـا
دەگەیشتەوە گوزەرێ‌و دەردەچووەوە • لە شۆێنێـکدا تەماشـام
دەکرد ، هەموو شتێکم لێ دیاربوو •• کوورەکەم دی کەل‌وکـۆم
کراوەو فرێ‌دراوە ، گورگەکەیش هەر (٣٠)ی هەنگاو بەو لاوەیەو
دەڕشێتەوە • کاتیرینیش بەسەریەوە وەستاوەو بە کەڵبەو چرنۆکان
لەعنەت بۆ دایکی دەنێرێ •• کەواتـە هـەر گورگی گۆرینـە ،
هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم ، کەچی ئەوەی بیرم لێ نەدەکردەوە
و بەخەیاڵمدا نەدەهات بەچاو بینم •

کاتیرین تاکو خواردی ، خواردی ، ئینجا کشایەوە بـواری

گورگیش بدا دەست پێ بکاتــەوە ، گورگ دەخــواو کاتیرنیشــ تێیەوەڕاماوەو دەم ئەتەقێنێ •• !

هەموو شتێك روونو ئاشــکرایە ، کاکەلــەبرالەی خــۆیان کردووە ، ! •

ئەوجار تێگەیشتم کاتیرین چ دەکا ، بەڵام ناتوانم بە تەنێی حوکم بەسەردا بدەم ، چونکە مام باچۆلا ئەو لەعنەتی‌یەی خۆشــ دەوێ‌و بەتەمایە بەری بۆ باوێ • وتم ئــەوەی دیتم پێی دەڵێــمو ئەو چۆنی حوکم دەدا بیدا •

مەسەلەکەم بە مام باچۆ وت ، بەڵام بڕوای نەکردو وتی :ــ بە چاوت نەدیوە ، بە خــەونت دیــوە ! ســەگ‌و گورگ چــۆن دانوویان پێکەوە دەکولێ ؟ •

ــــ: هاوبەشن مام باچۆ ، بەچاوی خۆمم دیتن •

ــــ: نەخێر کاریوا نابێ ، شتی‌وا مەحالە •

وتم :ــ وادەکەم بەو چاوانەی بینی •

ئیتر خواو راستان رۆژێ ، چاکم لەبیر نەماوە چ رۆژێ بوو، بەڵام لە دەوروبەری جێژنی ( قەدیس دیمتری )دا بوو • دیار بوو مام باچۆ قسەی خۆی بڕی‌و پێی وتم :ــ دەچم داران بۆ کۆخەکە خڕ دەکەمەوە ، تۆیش لەو ژۆرانە لە ( فایراك ) ، ( ئیمە بەو بەستە دەڵێین فایراك) بزنەگەل بلەوەڕێنە ، پاشان وتی : تۆ لەوێ خەریکی

لەوەڕاندنی بزنەگەڵ بە منیش خەریکی دار کۆکردنەوە دەبم •

ڕۆیشتم ، کاتیرنیشم لەگەڵ بوو •• ئەها ! ! بوو ،! ! هەر تازە بزنەگەل کەوتبووە سەر لەوەڕێ کە یەکێکیان کەوتە ماعە ماع، گورگەکە خۆی شاردبووەوە دەیـزانی ڕووماں بـەرەو کوێیە ، چاوەڕێی کردبوو تا تێدەپەرینو نێچیرەکەی ڕفاندبوو ••

کاتیرین وەڕیو کەوتە دوای گورگەکە بەڵام من نەمتوانی لەنێو قامیشەڵانەکەدا بیانبینم ، قامیشەڵانێکی چڕوپڕو هەڵچوو بوو بنیادەم سەری تیا ون دەبوو ! تەنها لەرینەوەیم دەدی ، دیـار بـوو بە تەنێا ڕێی دەکرد ، لە جـوولانەوەیا زانیـم بزنەکـە بـۆ کوێ ڕادەکێشێ :

هاوارم کرد

ــــ: مام باجۆ ، مام باجۆ ، وەختیەتی وەرە •

بەڵام تا مام باجۆ گوێی لێبووو هات گورگ لە گوزەرەکەی بەرامبەر بۆی دەرچووو ون بـوون ، پاشـان بەخـۆو بەبزنـەوە دۆڵەکەیان بڕیو خۆی دەکەلێنێك ئاخنی لەوێدا وەستا ، منو مام باچۆیش لە دیاریەوە وەستابووین • گورگەکە پڕی دایە بزنەکەو کوشتی ، ملی کـەلاشەکەیشـی ڕاکێشـا کاتیرنیشـی بەدواوەیـە نەدەوەڕێو نەخۆیشی تێك دەدا •

مام باچۆ هاواری کرد :

ـــ:  لەعنەت لە شیری سەگ ، ئەوە چی لێ‌هاتووە ! گۆڕاوە ؟

وتم :ـ راوەستە ئێستا دەبینی چی لێ‌هاتووە •

وەستاین ، تەماشامان کرد ، کاتیرین نەك وەکو دوژمنێك ، بەڵکو هێمن‌و لەسەرخۆ لە گورگی نزیك دەبووەوە •

گورگ سەیرێکی دەوروبەری کرد ، بێ ئەوەی کەڵبەکانی بشارێتەوە یا کارێکی لەو چەشنە بکا تەماشای کرد نە سەگ دەوەڕێ‌و نە گورگیش کارێ دەکا •• تێك گەیشتوون ! لەعنەت لە شیریان بڵێی چ چاوو ڕاویان کردبێ ؟ ، داخۆ چیان دەچاوی دایە ئاوا تەبان ؟ ، نازانم ، بەڵام گورگ وازی لە بزنەکە هێناو ڕێی بۆ کاتیرین چۆل کرد •• چووە ئەولاوە • کاتیرین لەبزنەکە نزیك بووەوەو کەوتە هەڵلووشینی ، وەکو گورگی کەڵبەی لێ گیر دەکرد ، بە چرنۆکی پارچە پارچەی دەکرد ••

مام باچۆ لە سەرساميا دەمی داچەقی بوو بڕوای نەدەکرد •• هیچی نەگوت ، کشایەوەو هاواری کرد :

ـــ:  راوەستە !

گەڕایەوە کۆخەکە تاپرەکەی بێنێ ، کە بەسەدای گوێی دارستان کەڕ دەکا •• من نەمدەزانی بۆ ئەوە چووە ، بەلام کە هاتەوە دیتم ئەوەی بەدەستەوە بوو •

سێرەی لێ گرت ، ڕەنگی دابچکوڕاو بوو بە خەزنەی سپی •• هاواری کرد :

ـــ : دەیکوژم گجوولەی پیرە خاینێ دەکوژم ! لەگەڵ گورگان خۆ لێك دەداتەوە ؟ بەڵام زۆر دوورە چاوەڕێی دەکەم تا دەگەڕێتەوە ئینجا لە تەختی نیوچاوانێی دەدەم ••

ئەمەش وا دەگەێنێ دیارە تا ئێستاش روحمی بۆ دەبزوێ •• دانشتین چاوەڕێی ئەوە بووین تاکو کاتیرین تێر دەبێ •

ـــ: کاری بزنێ لە کار ترازا ، یا وازی لێ بێنین تا پێش مردن تێر دەبێ ، سەرەرای ئەوەش زۆری بە دڵسۆزی خزمەت کردووین •• مام باچۆ دیاربوو لەرزی پێوە نووسا ••

پێم وت : ـــ

ـــ: خزمەتی کردین ، راستە ، بەڵام مام باچۆ ئێمە ئەگەر ئاردە گەنمەشامی نەدەینێ برسی دەبێ • ئەوجار تێگەیی خزمەتەکەی سوودێکی نی‌یە ، ئێتر بوو بە دەستەبرای گورگان ••

ـــ: نەخێر ! نەء ، بە هۆی برسی‌یەتیەوە نی‌یە •• پەروەردەی فێڵو مەکرانە •• راستی‌ی مەسەلەکە ئەوەیە •• پەروەردەی فێڵە فێڵ ! وای بە خەیاڵدا هاتووە ، « گەر ئاگاداری بزنەگەل بمو نەبم وەکو یەك وایە ، کە ئەوانیش ( قەڵێ ) م نادەنێ یا بەخۆم بیکەم » •• ئەوەتا کردیشی •••

قیژاندی •• دەیکوژم ، لێی خۆش نابم •

دەیکوژیێو دەیکوژێ ، بەڵام تاپڕی بەرز نەکردەوە ،

کاتیرنییش تێر بووو بواری دایە گورگەکەو رۆیی ، دۆلەکەی بڕیو تاوێ وەستا تۆزێ ئاوی دەسەرکردو کەوتە رۆیشتن •

ــ: دەی مام باچۆ دەی ئەگەر راست دەکەی رقت لێیەتی بیکوژە ! یا دەڵێی ڕقت لێ نیە ؟ ! •

تاپڕەکەی بەرزکردەوەو سێرەی لێ گرت ، پاشان بیری کردەوەو دایگرتەوە •• هاواری کرد •

ــ: ئای هەی چەند خاین دەرچوو ، دایکی پیرە ••• چۆن وازی لێ دێنم ، ئەمڕۆکە بزنێکم چوو سبەینێ هەمان کار دووبارە دەکاتەوە •• جارێکی‌تر تاپڕەکەی بەرزکردەوەو ( بووم !!)• کاتیرین راپەڕیو خۆی هەڵاوێت ، دوو سێ جاران خلۆربووەوەو پێی جووت بوون •••

مام باچۆ پێی وتم :

ــ: بینێژە ! حەیوانێکی بە فێڵ بوو ، چاڵێکی بۆ هەڵکەنە •• !

ناشتم ، تەنانەت بۆیشی گریام ، سەگم نەدیوە دەنگی بەو جۆرە بێو نایشیبینم •• ئەدی چاوی •• سەیری بکە بەڵام بێ ئەوەی قسە بکەی ••

پێی رەق بوون • منیش وەبن خۆڵیمدا •• مام باچۆ سەگێکی دیکەی بۆ ناردم ، کیسەێك هاڕراوی گەنمەشامیشی لەگەڵ ناردبوو رای سپاردم :

ـــ: دەولکێکی بۆ چێ بکەو خواردنی بدەیێ •

ئاخری هەستی پێ کرد ، بەڵام پاشی چی ؟ سەگە تازەکە دەستی کرد بە خواردن ، بخۆ بخۆ تاکو تەواو قەڵەوبوو ، وای لێ هاتبوو لەبەر قەڵەوی پێی ناخۆش بوو راوی گورگان بنێ مام باچۆ جارێکی دی لەچۆکی خۆیدا •••

دانی پێدا دەنێم کە من لە مەسەلەی بەخێو کردنی کسۆکان بە سەهوو چوو بووم •• تێری دەکەی قەڵەو دەبێ راوی گورگان نانێ تێری ناکەی لەگەڵ گورگی دەبێتە دەستەبرا •• بۆیە کە خواردنی دەدەمێ زۆر وریاو ئاگادارم دەبم •

# ڕۆژگاری پیاوان

لەو ساڵانەی جحێل بووم و خوێنم دەکوڵا، باوەکو ئەوەندەیش پان و تێکسمڕاو نەبووم ، بەڵام بەهێز بووم ، تفەنگم بەشانەوەبوو، خەنجەریشم لە تەنیشت خەنجەرێ دەبەر پشتێ دابوو ، دوو بوون یا سێ بوون لەبیرم نەماون ، بەڵام دەمانچەکەم لێرە ، لە کەلەکێ بوو ..

هەموو دەیانزانی سەر دانانوێنم ، بۆیە ، کە یەکێ دەیویست ئافرەتێ هەڵگرێ لەدوو منی دەنارد . لەوان ڕۆژگارانەشدا کە پیاو ڕۆژیان بوو ، ژن هێنان بە قسەی خۆش نەدەچووە سەر .

هاوسێیەکم ئافرەتێکی لە ! ( ناستان ) خۆش دەویست جارێکیان وتی :

ـــ : بڵێ چەندت دەوێ بۆمی راست کەی شووم پێ بکا ؟

وتـم :

ـــ : سێ دانە لە سەد لیفیەکانو دوو سەد لیڤیش بۆ خواردنەوە، هەمووی دەکاتە پێنج سەد لیڤو زەماوەند ساز دەبێ •

رێك کەوتینو ، دوای چەند رۆژێ چوونیە ناستانێ • • چوار غەریبە هەر گەیشتینە گوندەکە کارمان لە کار ترازاو ئاشکرا بووین •

بە کچەکەیان وت : ! بەهەر حاڵ دەترفێنن ! ) ئیتر هەرگیز وەدەر نەدەکەوت ، براکەی تفەنگی ئامادەکردو وتی : ( بابێن ! کەللەیان دوبەدەر دەکەم • )

یەك دوو رۆژان چاوەڕێ بووین ، نەهاتە دەرەوە ، رۆژی سێیەم ( شوکری ) کە دۆستێکی دڵسۆزم بوو لە ناستاندا ، هاتو وتی : هەســتن ، ئەوان رۆیشتن چوونــە بلاتییچی بۆ جــووت کردن ، وتم : ئەدی کچەکە ؟

وتی : کچەکەیش !

ئـەولا باشــتر ، مێرگێـکی لێیـەو کەسیشی لـێ نییـــە دەستەوەکەرێ بکا •• راستە براکەی هەروا ئاسان نییە بەڵام ئەو تەنیایەو ئێمەش چوارین ••

رووەو ( پلانتیجی ) وەرسوڕاینەوەو شەرابو عارەقیشمان لەگەڵ خۆ برد ، بەسەر ڕێگاو بەبەر ڕێگادا ڕۆیشتین : تا گەیشتینە سەر کانیاوێکی ژێر دار سنەوبەرێکی بەرزو هەڵچوو ، لەوێ چاوەڕێ بووین •

کێڵگە نزیك بوو ، دەماندیتن خوشكو برا جووتیان دەکرد •

وتم : با دەست پێبکەین عەرەق بخۆینەوە تانیوەڕۆ ئەو کاتەی کچەکە دێ گایەکان ئاوبدا ئێمەش دەیڕفێنین •

بەڵام پیاو شتێکی دەڵێو لە شتێکیتر هەڵدەنگوێ ! شوانێ ئێمەی دی لەڕۆخ کێڵگەکەدا خۆمان شاردۆتەوە ، وەسەر دارسنەوبەرێکی بڵند کەوتو پڕ بەدەنگ هاواری کرد :

— : هۆ •• هۆ شەیبان ئاغا ( ئاخر برایەکەیشی وەکو من ناوی شەیبان بوو ) پیاو لە دۆڵەکەدان پیاو وو •• ، خوشکت دەرفێنن ، پیاو •• دە •• ،، ،، !

بە پیاوەکانم وت :

— : کار لە کار ترازا ، با وەدەرکەوین :

براکەی کە بینیمانی خۆی ئامادەکرد ، داسەکەی بەدارخۆخەکەوە بوو دەستی دایێو خوشکیی دەپشتەخۆی گرتو هاواری کرد :

— : لەکوێ هاتوون بڕۆنەوە ئەوێ ، دەنا وادەکەم دایکتان

سنگتان بۆ بکوتێ ! پاشان بۆ ئەوەی لێی نزیك نەبینەوە بەرد بارانی کردین •

ئێمە دەچووینە پێشــێو ئەویش بــەردی دەهاوێشــتن هاوارم کردێ :

ـــ : دەبێ ئەم کارە مەیسەر بێ ، ئەگەر ئیشەکەیش پەیوەندی بە گریانی دایکانەوە هەیە ئەوا من لە تۆ بە جەرگ ترم • داسەکەت فرێدەو بڕۆوە سەر کاری خۆت ، خوشکیشت بۆ شۆینێکی ناخۆش نابەین ، دەیبەینە شار •

قیژاندی :

ـــ : بۆ دواوە ! دەنا سەرتان پان دەکەمەوە !

دیار بــوو هاوڕێــکانم شەقــاویان کــورت بوونو نەختێ سڵەمینەوە ، بەڵام من نەوەستام ، دەستێکم لەسەر خەنجەرو ئەوی تریشم لەسەر دەمانچە بوو ••

بانگم کرد :ـ

ـــ : ئەگەر مەسەلە ، مەسەلەی سەرپان کردنەوەبێ ، وەرە پێش حەڵاڵ زادە منەتت نەبێ ، تەکانمدا بیگرم داسەکەی بەسەر سەرمدا هەڵاوێت، ئەگەر خۆم نەدابووایە لاوە، زۆری نەمابوو بمکا بە دوو لەتەوە ، بەڵام دەستی هەر بریندار کردم ، لێرە لە بازووما پارچەێــکی لێ داماڵی تاکــو بردیــەوە ســــەر

ئێسقان ئیتر دەستی چەپەم نوقستان بوو •

بەدەستی راستم ملم گرت‌و دامهێنایەوەو هەندی لەنێبێ لە لە عاردمدا ، ئەو کات من خورت‌و بە هێز بووم بە جۆرێك، دەمگرت‌و نەمدەپاراست ••!

کلاوەی چۆکم لە زەوی گیرکردو بە دەستە ساغەکەیشم شـوارکێـکم دەســـتدایێ‌و بەربوومـە ســەری‌و قــەوارەیێکـی هەندەم تێ کرد • شوویتکیشم کردەوەو پێمان لەدار سنەوبەرەکـە بەستەوەو برینی سەریشیمان پێ تیمار کرد ، وەك عەمامە لەسەرمان ئالانـد •

ئاورێکمان لە دەورو بـەرمان دایـەوە ، تەماشا دەکەیـن خوشکەکەی رای کردووە ، لەو کاتەدا تێی تەقاندووە کە ئێمە خەریك بووین حیسابمان لەگەڵ براکەی پاك دەکردەوە ••

« ئەدی ئێستا ؟ ! »

بەسەر زاوای جحێلمدا قیژاند :

— : ئەرێ تۆ چی ؟ مەڕی ؟ لەعنەت لە شیرت چاوت دەکوێـدا بوو ؟

ئەملاو ئەو لای بۆ گەڕاین ، لە ناو چەند درەختێکی تازە هەڵچوودا دۆزیمانەوە ، برۆی وێك‌هێنابوونەوە بەبێ دەنگی لێی راکشابوو •• هەڵمان کوتایە سەری ، راپەڕی‌و لە گەڵمانا کەوتە

شەر ، ئەو تەنیا بوو ئێمەش چواربووین ، لەگەڵ ئەوەشا گێژی کردین •• بەڵام ئێمە کەزیمان گرتن‌و ئیتر نەرم بوو • وەپێشەخۆماندا بەرەو کێڵگە بۆ لای براکەی •• دیار بوو براکەی دەپاڕایەوە :

— : لێم گەڕێن با بڕۆم ، بەرڵلام کەن حاڵم پەریشانە ، جێم مەهێڵن لێرە بەو سنەوبەرەوە بمرم ••

دڵم بێی سووتا ، بەرەڵلامان کرد •• کە لەدارمان کردەوە، وەك بەرزەکی بانان تێی تەقاندو گاسن‌و خوشك‌و هەموو شتێکی لەبیر کردو بەناو دۆڵەلەکەدا ئاوابوو ••

بانگی بووکێم کرد :

— : هەستە دەی ، هەستە خانمی بەرێز وەگەڵمان کەوە تاکو ببیتە ژنی ئەو ( قۆزە ) !

— : ئا ، هی ئەوەی دوو تاڵە مووی لە روومەتان شین نەبووە ؟ تفووو ( تفێکی تێ‌کرد ) شتی‌وا هەرگیز نابێ ، هەهەی ببم بە ژنی ؟ ههێی ••!

هەڵمان کوتایە سەری‌و بردمان بەسەر گردەکەمان خست ، بەڵام نەدەڕۆیی ، کەزی ئەستوور بوون ، نیوەمان دەرکێشان ، کەچی چەقی بووو نەدەرۆیی •

پاشان خستمانە سەر شانمان ، ئەو بەبێ ئەم بە دەستی چوار

دەستە هەڵمان گرتو گەیاندمانە ( دیگینگۆف ئازماك ) .

پێش ئەمە ، زۆری تریشم رفاندوون ، بەلاّم وەك ئەمەم نەدیوەو نەدیوە ، چ لەبارەی هێزو تاقەتەوە چ لەبارەی عینادیەوە، ئێسك ساغ ، تێك چەقیو ، ئەگەر باسی شتی دیکەیشی نەکەین ئۆمێدم وایە کاکاغە ئەم سەرشێتیو کەفو کوڵە نەبینی !

لە دارستانەکەوە بەرەو ( گرۆختنۆ ) شۆڕبووینەوە . لەو بڕوایەدابووم براکەی لەگەڵ چەند کەسێك . بە دوامانەوە بێ ، بۆیە رێگای خۆمان گۆڕیو لەباتی ئەوەی بەرەو ( دۆفلن ) بڕۆین ، بە پێان بە ناو دارستاندا کەوتینەڕێ ..

زۆری ماندوو کردین ، ئیمەش دامان گرتو رامانکێشا هاوەڵ کراسو ماوەڵ کراسی تیزماڵ تیزماڵ ببوو .

کابرای زاوا یەك بە خۆی هاواری کرد !

ـــ : با وازی لێ بێنین ، جێی بێڵین ! کوڕە خۆ ئەوە ئافرەت نی‌یە دڕندەیە !!

ـــ : بیگرە ! ئەوە نێچیری خۆتە ! دەتەوێ وازی لێ‌بێنین لە دوایدا پێمان بلێن پێی نەوەستان ؟

پاشان شۆربووینەوە ، شۆڕبووینەوە تا رووباری (گرۆڤۆتنۆ) دەبێ لە رووبار بپەڕینەوە جا بە( حەمامی بۆنارد ) بەرەو ( دۆڤلن بڕۆین .. دەبێ لە رووبارەکە بپەڕینەوە ، بەلاّم چۆن ؟

رووبار شێلووەو وەك شێتان کەفێ دەکاو تیژ تێدەپەڕێ ، پردێك هەیە ، بەڵام لە گوندی‌یەو بۆ ئێمە نابێ‌و پێویستە بەهەر جۆرێکیش بێ لێ‌ی دوور بکەوینەوە .

لە خۆمان‌را نەدی بپەڕینەوە ، هەستاین گەڕاینەوە زیاتریش لەبەر ئەوەی چونکەهەردوو یارمەتـی دەرەکەمـان رازی نەبوون

بپەڕینەوە ، دیاربوو رووباریان ترسناك دەهاتە پێش چاو ، ئافرەتەکەیش قورس بوو و نەیشی دەویسـت لـە خـۆڕا خـۆی باوێـتێ ..

بە کابرای بە حیساب زاوام وت :

ــ : بیخەرە سەر پشتم

جوانە جوانە .. بەڵام نە هەندە باڵای بەرزە کابرا بە ملیشی راناگا ، ئەدی چۆنی هەڵگرێ‌و بیهاوێتە سەر پشتم ..

بانگم کرد :

ــ : داوەرەوە ، داوەرەوە با سـواری سەر پشـتت بـێ . .

داهاتەوە ، بەڵام ئەم سواری نەبوو ، هەوڵمدا بیخەمە سەر پشتی ، بە دەستێك هێزم بێ نەشکا قاچی لەزەوی چەقاندن‌و لە جێ‌ی خۆی نەبزووت .. خەنجەرم هەڵکێشا بۆ سنـگم بردوو و هاوارم کرد :

ـــ : هەر ئێستا خوێنت فڕ دەکەم ! ، خەنجەرەکەم نەختە نەختە پاڵدا خۆی داهێنایەوە ، زیاترم پاڵ پێوەنا ، زیاتری خـــۆ داهێنایەوە تاکو کەوتە سەر پشتی زاوا ، هەڵیگرتو یەکسەر بۆناو ئاو •

دەستم دە ئەوکێ ناو بە سەرمدا قیژاند :

ـــ : بڕۆ ، ئاوڕان مەدەرەوە ، من قاچەکانی دەگرم • رۆیی ، رۆیی تا کەوتە ناو چاڵێك و دەنێو ئاوێکی شێلودا نقوم بوو ، ئافرەتەکەیشی لەگەڵدا بوو ••

ئیتر لە گۆرەویەکانی زیاترم لە دەستدا نەما ، هاوارم کرد ! ( ئەی هاوار هەی بووکە شۆخ رۆیی ! ) ، خـۆم لـە ئاوەکەدا نقوم کرد هەر گرتمو نەمگرت کوێر بووم چم نەدەدی ، ئەمن لـە ئاوێ ناترسم ، بەلام نـە ئاخر ئـەوە ئاو نەبـوو ، تێکەڵەیێـکی ترسناك بوو لە تیشەبەردو رەگو ریشەی درەختان ، هەندێك لە سکت رادەچـوون ، هەندێکیـش لە شانـت ، هـی وایش هەبوو وەڕانت دەکەوتنو بانگلۆزیان دەکردیەوە ، جا پیاو خۆی بپارێزێ یا یەکێکی تر ، ئاخ خۆزگە بە دوو دەستان دەبووم ، بەلام نە بە دەستێکم ؟؟

قاچی ئافرەتەکەم گرت ، بە دەستی نا بە ددانم گرتن ، بە دەستەکەیشم رەگە دارێکم گرتو تا کەنار بە سەریدا رۆیشتم ••

دوو سەعات بوو نەمان دەتوانی قسە بکەیـن لاڵ بووین ،

شین هەڵگەڕابووین لەبەر مانگەشەوێ ••

نیوەڕۆ بوو کە لەگەڵ براکەی پێك وەرهاتیـن‌و بـە دوای ئافرەتەکە کەوتین خـۆر ئاوایێ هێنامانـەوە ، ئـەوی‌تـر لەبـەر مانگەشەودا بوو •

هەر دانیشتین‌و دانەنیشتین ، وتم :

ــ : هەستن با بڕۆین !

ئافرەتەکە قیژاندی :

ــ : ئەمن بێرەدا سەر ناکەوم ، باشتر وایـە دەئاوێم باوێـن !

وەرم گیڕایەوە وتم بە خۆشی قسەی لەگەڵ بکەم :

ــ : هەستە ئامینە ، بە خۆشی هەستە ، نابێ چی‌دی خۆگـران بکەی ، مادەم ئێمە تکات لـێ دەکەین نابـێ چی‌دی خـۆت گران بکەی ••

ــ : نە !•• هەرگیز ، برایەکم هەیە لە ( دراما ) ، ئەگەر پێ‌ی بڵێم بە لیرانت خەنی دەکا ، لێم گـەڕێ نامـەوێ شووبەوە بکەم •• لێم گەڕێ •

کابرای زاوا دانیشتبوو بەترسێکەوە چاوەڕوانی دەکـرد وتـم :

ــ : هەستە ، بە مـێردت دەدەین ، ئەوەتـا شۆڕەسوارەکەت ئەوەتـا !

ـــ : ئەو ( شۆڕەسوارەم ! ) ناوێ جا لێم گەڕێ : لێرە دەمرم•• لە جێی خۆم نابزووم !

دەمانچەکەم هەڵکێشا لوولەم تێ کردو وتم :

ـــ : هەشتم کووشتوون ، تۆش دەستە هی نۆیەم ، جا ئەگەر دەرحاڵ رەپێ نەبیو نەرۆیی ، کوژراو هەشتن تۆیش نۆیەمین •

بە نابەدڵی هەستایەوە •• رۆیشتین •• رۆیشتین تاکو دەمەو بەیان ، سەیر دەکەم ! ( بۆنار )مان بەجێ هێشتووەو گەیشتووینەتە خوار ( کریفۆبیلۆ ) و رووومان لە ( دۆفلن ) دایە•

بە درێژایی شەوێ بەسەر رێگاو بەبەر رێگایش بە گوزەرگای بەر تەسكو بەناو دڕكو داڵدا رۆیشتووین ، جلكو بەرگمان پاتاڵ پاتاڵ ببوو دەتگووت بەناو دارهەنەی پەڕەکەردا رۆیوە پارچەی بەساغی نەمابوو ، بۆ ئیمەیش بێ کراسو شەڵوار بەهەر حاڵ ، بەڵام چۆن لێ بگەڕێین کە ئەو بەم چەشنە بەشاردا تێپەرێ ؟ بە زاوام وت :

ـــ : هەستە بڕۆ دەستە جلكێكی بۆ بهێنە ، با خەڵكی ( دۆفلن ) بەم شێوە نابەروێکەی نەبینن • جودای کردەوەو وتی :

ـــ : باشە ، بەڵام لێمان گەڕێن تاوێ بەتەنێ بین یەكدوو جار خۆ لێك بسووین بەڵکو ئەوە خوایە تۆزێ دڵی نەرم دەبێ •

وتـم :

ــ : باشە !

رۆیشتن‌و رۆیشتین ، قڵفەی پشتێنـدێم کـردەوەو هـاوارم کردنێ :

ــ : ئێوە دەپێشدا بڕۆن ، من نەختێ تەنها دەبم •

رۆیشتن ، منیش مامـەوە چاوەدێریم دەکـردن :

جارێکیان لەسەر ڕێیە وەستان ، کابرا دیاربوو شتێکی پێ وت‌و بەرێ یەکی دایێ‌و لەعاردی‌دا ، خۆی هەڵداسەرێ‌و لاقی گرتن‌و دەستی کرد بە یاری لەگەڵیا ، رووی لەگەڵیا خۆش‌بوو ، بەڵام ئەو رانەدەوەستا ، نەختێ لاربوونەوەو

بەرەوپێش چوون ، زاوا یا دوو یا سێ جاران بەتـەواوی نازانم خلۆر بووەوە •••

وەك هەموو جارێ ، گەر کەری ئەو بارەی نیت بۆچی خۆتی دەدەیتەبەر•• گەیمەوە ئەوان‌و رۆیشتین ، کابرام نارد جلکەکان بێنێ ، من‌و ئامینەش لەوێ لەسـەر رێی ( دۆڤلن )دا چـاوەڕێ بووین چاوی لە چاوی بڕیم‌و وتی :

ــ : بۆچی دەمدەیتە ئەو گولەی پیسم بکا •• ؟ شووی پێ ناکەم، ناچمە دۆڤلن •••

وتم :

ـــ : دەچی‌و دەشچی ! پارەی هێنانتم وەرگرتووە ••

ـــ : ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی بە ماڵ هەبێ : ئەوا برایەکەم خەنیت دەکا بەلیرەی‌زێڕ بەرامبەر بەوەی تۆیش وازم لێ بێنی •

وتم :

ـــ : لەراست قسەی من زێڕ ناکا هیچ ، دەبێ بچی !

ـــ : لەگەڵ تۆ ، نەك هەر بۆ دۆڤلن ، بلێ بەنێو دەریاشدا دێم ، بەڵام لەگەڵ ئەو ناچم !

خودایە ئیش چیان بە سەر دێ ؟ چی بکەم ؟ گرێیەکە بۆ خۆی ، راستە ئافرەتێکم لە ماڵێ یە ، بەڵام نە ئەمەیان ژنێك‌ونێوە ، سپی‌یە دەڵێی شیرە ، چاوی وەك خەنجەرێ دەبڕن ، بەڵام مەمکی ؟ ، مەمکی براینە تەنوورە تەنوور ! !

ـــ : هەوێرەکەی پێوەدەو بخۆ !

بانگی کرد :

ـــ : دەتەوێ ؟ هەر ئێستا !

ئەو کاتە خەتا بە خێر گەڕایەوە •• بە پێش خۆمدا بۆ کێڵگەکە ، خۆمان لە گۆشەیێك دا خزاندو یەکتریمان لە ئامێزێ گرت ، پەلکە گیای پێوە نەمابوو ، هەموومان شێلا ، بەسەرمدا هاوارکرد : تا ئێرە بەسە !

ئەی ئێستا ؟ بیبەم ؟ نەیبەم ؟ لەبەر برادەرەکەم شەرم دایگرتبووم •• ( نایبەم ) ••

دڵەکەمی لەناخەوە پێکا •• هەستم کرد پەشیمان بوومەوە چاوی دەمن بڕیبوو لێی پرسیم :

ـــ : لەگەڵ تۆ دێم ، وا نییە ؟

دڵم لە نێوان دوو ئافرەتدا، بوو بە دوو لەتەوە ، لەو حاڵەتانەدا دەتەوێ دوو دڵت هەبن یەکیان بۆ شەرەف ئەوی تریش بۆ زەوق و رابواردن : بەڵام دڵی من یەکێکە ، ئەوەندەی دابەشی دەکەم ، ئەنجام هەر دڵێ دەمێنێتەوە •

بەرەو شەرفم هاوێت و وتم :

ـــ : لەگەڵ من نایی ! هیچ چارێ نییە دەبێ لەگەڵی بچی •

هاواری کرد :

ـــ : لەگەڵی ناچم !

ـــ : دەبێ لەگەڵی بچی ! !

ـــ : ئەمە نابێ •• ! دیار بوو خۆیشی بۆ راکردن ئامادەکرد کە نیگامان لە یەکدی چەقیو تەکانیدا ، خۆم بە زەوی داداو پاژنەی پێم گرت : بواری ئەوەی نەدام خۆم پێ رابگیرێ و کێل ببمەوە ، وەك رەشەبا وا بوو : وەردەچەرخایەوە دەردەبەڕی ، بەسەر دڕك و چەقەبەردان رایدەکێشام ••• بەڵام من وەك کسۆکانم لە پاژنەیەوە گرتبووو وازم لێ

نەدەهێنا، تاکو ساتمەیێکی بردووو کەوت • کەفی دەردا بووە سەر زاری ، منیش ماندوو بووم ••

دانیشتین پشوویێ بدەین ، پێم وت :

ــ : ئێستا دەڕۆیی ها ؟

ــ : هاواری کرد •• دەستم دەبەر پشتێ نای ، تەسلیمی تۆ بووم •• پاشان کابرا هاتەوە •• دەورەماندا و بەرەو دۆڤلن کەوتینە ڕێ •

دەبووایە لە پردەکەی سەر رووبار بپەڕینەوە ئەنجا وەك دەڵێن لە ماڵێ بین ، ئەمەش مانای وایە بەمرازی خۆمان گەیشتین •• ئەوەم بە خایاڵدا هات ، تێهەڵکەم گۆرانی بڵێم ، کاتێك بوو بۆ گۆرانی نەبووایە بۆ چیدی دەست نەدەدا •

لە پردەکە نزیك بووینەوە شتێکمان لێ راپەڕیو هاواری کرد :

ــ : بووەستن ! دەنا وەدەکەم دایکتان خڕە فرمێسکتان بۆ هەڵبارێنێ !

لوولەی تفەنگێکم دی ، هەر ( دە ) هەنگاوان دوور دەبوو ، ئاگاداربن •• ئاگاداربن •• سەرێکی بەستراوم دی زانیم کە براکەیەتی ، زانیبووی لەو ڕێیە زیاتر ، چ ڕێی‌دی ناچێتەوە ( دۆڤلن ) ، بۆیە لێرە مە دەم رووبار لەژێر پردەکەدا چاوەڕێی کردووین •

که هاوڕێکەم بەو کەین‌وبەینەی زانی دیاربوو لەپشتمەوە دەرۆیشت ، پاشان لەسەر ڕێیەدا شۆڕبووەوەو خۆی لە پەنایەك نا . من لە نێوەڕاستی ڕێگا بووم ،دەستێکم بەستراوە ، دەمانچەکەشم لەبەر پشتێیە پێش ئەوەی دەستی بۆ ببەم ئەوە دەزانم بە تفەنگەکەی کارم لەکار دەترازێنێ .

ـــ : نەجوولێیەوە ! دیاربوو براکەی هاواری کردو بەرەو ڕووی منیش هات خوشکەکەی بباتەوە ، لوولەی تفەنگێی بەرەو ڕووی منە .. لەو کاتەدا کێ بڕوا دەکا ، خوشکەکەی ، کە لە نزیك منەوە بوو خۆی دامەپێش .. ئەو خوشکەی کە بە درێژایی شەو بەدوای ڕاکێشابوو ، پارچەیێکی لە جلکان بە سەلامەتی نەمابوو ، تەکان بداو بێت لە پێشم بووەستێ‌و بە خودی خۆی بمپارێزی ؟

بە دەستە ساغەکەمم لەناو قەدێمدا گرت‌و هاوارێکی براکەیم کرد :

ـــ : تاقە هەنگاوێکی‌تر باوێی خوشکت دەرووباری داوێم ! ڕووباریش چ ڕووبار لە ژێرمانەوە خۆێغی دەکرد .. وای لەو کارەساتە !

لە جێی خۆیم چەقاند .. بۆ دواوە.. بۆ دواوە خوشکەکەیم دەدەستی دابوو توندم گرتبووو بەرم نەدەدا . بەسەر پردەکە تێدەپەڕیم ، ئەویش تەماشای دەکردم بێ ئەوەی بەدوام بکەوێ

یاخود تەقەم لێ بکا ، لەو ساتەدا ئەو مرۆڤەم وەك مۆمیایێ ، یـا مرۆڤێکی لە شەمێی دەهاتە بەرچاو ، سپی ببووەوە ، وێنەی سەنەمێ لێی دانیشتبوو تفەنگەکەی فڕێداو دەستی بە چاوان وەناو دەستی کرد بە گریان ••

پیاوم نەدیبوو بگری ، ئەوا دیتم •• هاتە سەرم بگەڕێمـەوە خوشکەکەی بدەمەوە بەڵام نەمکرد •• تۆ شتێکت دەوێ کەچـی دەسەڵاتت بەسەر شتێکی تردا دەشکێو لە پاشـان هی سـێیـەمو چوارەم دەکەی •

بەم چەشنە بردمانە دۆڤلن ، لەوێش یەکسەر بۆ لای شـێخ ، لێی مارە بکا ••

شێخ لێی پرسی :

ـــ : تۆ ئەو کابرایەی بە مێردت قبوڵ دەکەی ؟

ـــ : نامەوێ !

شێخ وتی :

ـــ : بە راستی تۆ ئافرەتێکی قایمی ، لەپاڵ یەکیـان دەرهێنـاوە، کەچی ئەو هەر سوورە لەسەر قسەی خۆی •• ببە شەیبـان ببیە ! لەدارستانێی بە رەڵاکە • با لەگەڵ دڕنـدان دابێ بەڵکو هۆشـی بێتەوە سەر •• ئیتر کاری لەکار ترازاو لێکمان مارەکردن ••

دەپرسی : شەیان داخۆ لە دوایدا بەچی گـەیی‌و چی لێ هـات ؟

دوو مانگ بوو یا سێ ، پێکەوەیان گوزەراند جارێکیان بــە ژنەکەمی وتبوو : دە یاڵڵا( یالا ) ! خوشك ! با بڕۆین لەگەڵ خۆم بەرە گەنمەشامیان لەبێستانێ بچێنن ، حەزم لێیە فێرم بکەی داخۆ گەنمەشامی چۆن دەچێنرێ ••

مێردی ئیزنی دابوو ( پێش ئەوجاری رێی نەدەدایێ ) رۆیی لەگەڵ ژنەکەی من فێری بکا گەنمەشامی چۆن دەچێنرێ ••

لەدواییدا ژنەکەی من گەڕایــەوەو ، ئــەو نەهاتــەوە •• رووبارو رووبار رۆیشتبوو تا گوندەکەیان ••

پاشان لەدووی ناردم بچم لێی بدوێین ، لێــمدا چــووم ••

پێی وتم : لەکۆڵ ئەو زار بەلیکاوەم بکەرەوە ، با تەلاقم بدا هەرچی دەڵێی ئامادەم •

لێم پرسی : جا کە ئەوەم کرد چیم دەدەیێ ؟

وتێ : دوو لیرەو پارچە چەرمێك بۆ پێتاوان ، مەررەزیشت بایێ سێ جووتە بەڵەك پێچان دەدەمێ ، دیســان وتی :ــ کــەنگێ ئەوەت کرد هەموو شتێك ئامادەیە •

گەڕامەوە ( دۆڤلن ) ، کابــرام گــرتو پێــم وت : ئەگــەر بەخەی ئەو ژنەی بەر نەدەی ئەوا بچیتە پەرەکەی ئاسمانێش بــۆ تۆ نابێ ! •• ئێستاش ئەگەر هەر حەزت لێ‌یبێ ئەوا دەبێ جاری پێشوو چۆنمان رفاند بیرفێنینەوە •

بە ترسێکەوە وتی : نا نا نەکەی ، هەرگیز : گەر تا دەشمرم بێ ژن بم دووبارەی ناکەمەوە •

وتم ـ: مادەم ئیشەکە دایە ، بەرەڵڵای کە، یەکێکی دڵ نەرمترت بۆ هەڵدەگرین ، کە ئەوەندە کەللەرەق نەبێو لە گەڵتبژی •

ـــ : ئەمجارە چەندت دەوێ ؟

ـــ : سێ لەو ( سەد لیڤ ) یانەو دووسەد لیڤیش بۆ خواردنەوە، هەمووی دەکاتە پێنج سەد لیڤ •

وتی : ـ باشە دەتدمێ ، بڕۆ بەو هارەی بڵێ نامەوێ •

ـــ : پێویست بە بێگووتن ناکا ، لەگەڵم دیێیە ناستان لەوێ با شێخ لێکتان بکاتەوە ، پاشان چی بە چاك دەزانی دەیکەی •

چوونیە ناستان ، شێخ لە یەکتری جوداکردنەوەو تەلاقیدا ، پاشان یەکیدیمان بۆ هێنا ، رفاندمان ، بەلام نەك وەك ئەوەی پێشوو ، هەر کەزیمان گرتو نەگرت کارەکە مەیسەر بوو ، ئەویش دوو لیرەکەو ئەوەی لەگەڵی گووتبووم دایمێ •

زۆرم ئافرەت رفاندوون ، بەلام تەنها ئەوەیانم گەوتە بەردڵ ، ئافرەتێکی ئازا ، هەر نزیکی دەبیەوە دەبینی لە ژن زیاترە •• ئێستاش بیری دەکەم •• بەداخەوە •• !

بەلام ئەدی پێم نەوتی تۆ شتێکت دەوێ کەچی دەسەلاتت بەسەر شتێکیتردا دەشکێ ، پاشانیش هی سێیەمو چوارەم دەکەی ••• ؟ •

# دەرەختێکی بێ ڕەگ

لێم دەپرسی ناوت چی‌یە ؟ سوپاست دەکەم !

ساڵێکی تەواوم لەم شارەیدا بەسەر برد ، هەموو ڕۆژێ لەسەر ئەم جێیە دادەنیشم ، تا ئەو سەعاتەی کەسێك لێی نەپرسیوم « ناوت چی‌یە ؟ » •• هەرگیز ، تۆ یەکەمین کەسی •• بۆیە سوپاست دەکەم ، خوا لەسەر بەدەنێکی ساغ ڕاوەستاوتان بکا ، هیواداریشم نەگەینە ئەو ڕادەیەی منی گەیشتوومەتێ •

ئایا بپرسیم ؟ تینووم ؟ نەخێر ، تەماشای ڕووی دەرەوەم بکە بێ عەیبم دەبینی • کچەکەم شووی کردووەو لەگوندیدا دەژی• منداڵەکەی لەوپەڕی تەندروستی دایە ، مێردی سەرۆکە ••• کوڕەکەم لە وەزارەتێدا پێی دەڵێن گەورەی ئەندازیاران شایەد

نامەیێکی بە قەوارەی چەرچەفێ هەیە ، ئوتۆمبیل دەیباتە سەرئیش‌و ئۆتۆمبیل دەیهێنێتەوە ، ژنەکەی پزیشك‌و فەرمانبەرەو مووچــە وەردەگرێ ، لە حــەوزێکی فەخفــووری بۆرسلانیــش دە ئــاوێ دەکەون ، خواردنم ئەمما خواردن ، جێ‌و بالنگانیشم ئەمما جێ‌و بالنگان ، لەگەڵ ئەوەشدا حاڵم لە ماڵێــدا حاڵ نی‌یــە ، تابڵــێ‌ی خەراپە ، بەڵام چار چی‌یە ؟ لــێ‌ی دەکشێمــەوە ، دەبنیســێم‌و دەتوێمەوە ، نە تام لە خواردنێ دەکەم نە دەتوانم لە بیرەخەوێ رابچم ، سەرەڕای ئەوەش گەلەك خەڵــەت‌و پەڵەتم لــە مێشك‌دا دەخولێنەوە کەسێ نابینم بۆی بگێرمەوە ..

بیگێرمەوە ؟ کەواتە پێم دەڵێن دەبەنــگەو بەڵــکو شێتیش ، سەیرێکی ئەم نموونەیە بکە : شتێکی سادەو ساکار ( ماست ) .

بە کیرچی کوڕم وت: کورم! کیرچ لێم گەڕێ بابچم ماست بکرم،لێم گەڕێ تاکو ڕابێم وەك ئینسانێك کە خەڵکی دەبینێ‌و دەیبینن ، کە بانگی دەکەن فێنك دەبێتەوە ، مەگەر وانی‌یە ؟ وەڵامی دایەوە :ــ ناچی . لەوانەیە ئاگات لەخۆ ببڕێ ئۆتۆمبیلێ شتێ خۆت پێ‌دادا ، ئەو وەختە کێ قۆڕ بەسەری خۆی دەکا ، ( من ) . وەك وتم لە ماڵەوە دانیشەو چی بە چاك دەزانی ئەوەی بکە !

جالــە ماڵــەوە چ دەکــەم ، ماڵــێــکی گــەورە ئەســپی تیــا تــاودە ، پانسیۆنێــکی تــەواوە ، ڕێــك‌و پێــك لــە ژوورەوە رازاندراوەتەوە ، هەموو شتێکی تێدایە ، مافور لەپاڵ مافوری‌یە تا

له ڕۆیشتنا ساتمه نەبەی ، عاردە دارینەکەی لووس و خلیسکانــە هەر لەسەری بجولێتەوە دەکەوی • ـ لە ژوورەوە پاڵکەوە ـ ، کوڕەکەم دەلێ لە ژوورەوە پاڵ کەوە ، بژی ، بخۆ ، بخۆرەوەو بیر لە هیچ مەکەرەوە !!

ئەی هاوار ! چۆن بژیم ؟ لەگەڵ کێ ؟ لەگەڵ مێز ؟ یـــا لەگەڵ سندووقی نوینان ؟! ئەو خۆی و ژنەکەی ئێــواران نەبــێ نایەنەوە ، لەگەڵ گەردی بەیانیدا وەدەر دەکەون کە دەشگەڕێنەوە لەپاڵ یەکدی ڕوو بە سندووقەکەی شەیتان دادەنیشن فلیمێ ببینن، کە وەختی نووستنێش دادێ پێکەوە پێم دەلێن هەستە •• شەوباش، شەوت باش خواحافیز ، شەوێکی خۆش ••• تا بەو جۆرە وشانە سالێك و ـ ئەوەندەیە پێك دەگەین و لێك جودا دەبینەوە ، تەنانەت کە منداڵەکەیان لە ماڵەوە بێ چاکـترە ، یـاری لەگەڵ دەکەم ، چاوەدێری دەکەم ، بەمەیش تەمم لەسەری پەرت دەبێ بەلام بووکە چۆلی‌یەکەم ـ خوای لێ رازی بێ ـ لە باخچەی منداڵانی داناوە ، ئیتر هەفتەی جارێك نەبێ نایبینم ••• هەموو یەك شەمموانێ •

دەزانی بۆ چی ناردوویەتیە باخچەی منداڵان ؟ تاکو وشەو قسەی دێهاتم لێ فێر نەبێ ، تا زمانی لەنگ نەبێ کەمن بە شێوەی گوندی لەگەڵی دەدوێم• لەو باوەڕەدای بازێ جنێو منێوم فێر کرد بێ ؟ نەخێر ، تەنها لە پێش ئەو قسەیکم لەگەڵ کرد لەباتی ئەوەی بلێم ( دار ) پێم وت ( شووڵ ) •• منیش مەبەستم لە دارێـــکی

باریکەلە بوو کە بۆ لێدان بەکاری دەهێنین ، ئێمە لە گوندی پێی دەڵێین ( شووڵ )، لەبەر ئەوەی باریکەلەیەو لە کاتی لێدان دەچەمێتەوە ، لە دەستی نەوەکەم نابوو ئەسپەکەی پێ لێ خوڕێ، وتم :ـ ها کوڕم ئەو شووڵەی بگرە بەر نەبێتەوە دایکی قیژاندی:ـ ئەو شووڵە چی‌یە ؟ بۆ نەت وت ( دار ) ؟ تۆ بەم جۆرە وشانە زمانەکەی تێك دەدەی ••!

ـــ : ئنجا بووکێ چی تێدایە ، منداڵەکە ئەم جۆرە وشانەیشـس فێردەبێ ـ ( دار ) بە ئەستوورەکەی دەڵێن ، بەڵام باریکەکە پێی دەڵێن ( شووڵ ) ، ئەویش هەر لە دارەوە وەرگیراوە، لێی گەڕی با فێری ببێ لەوانەیە پێویستی پێ بێ •

ـــ : نابێتە شوان تا پێویستی بە ( شووڵ )ی تۆ هەبێ ، کە دەگاتە ئەوەی خوێندنی دواناوەندیش تەواو دەکا زمان فێر دەبێ ، ئەو کات بڕیاری پێویست دەدا •• بەهەر حاڵێ ، پێویستی بە ( شوول )ی تۆ نابێ •

هەر بە هۆی ئەم شووڵەیشەوە بوو نێردرایە باخچەی منداڵان ! بە مێردەکەیم وت : چاکتر وایە ، من بگەڕێمەوە لادێ، منداڵەکەش بێتەوە ماڵێ •

بەڵام ئەو کارەکەی بڕاندەوەو وتی :

ـــ : هەرگیز ! گەڕانەوە نی‌یە •• دەگەڕێیەوە بەتەنێ بژی ،

تا بکەومە بەر زارو زمانی خەڵکی لادێ ! ( ناتوانێ بابـــی بەخێو بکا ) ..

لێرە پاڵدەوە ، بخۆو بخۆرەوەو بیر لە هیچ مەکەرەوە..

بخـۆ ! بـەڵام ئاخـر نە چێشـتی گـەرم کراوەی نـــاو قووتووم پێ خۆش نیە ، ئەوەی لە قووتوو ئاخنراوە ، کەبابـی ناو قووتوو هەمــوو شـتێك قووتوو کراوە ، قووتوو دەکەنەوەو خواردن تێ دەکەن لە هەموو ئیشمانیش وێرانتر بووکەکەم تیژاوێی بەسەر دادەکا .. کەچووە ئەڵەمانیا ، دیتی لەوێ هەموو شتێك بە تیژاوێ دەخۆن ، ئەویش هەستا ئامێرێکی ئامادەکردنی کڕی هەر تەواو دەبێ دروستی دەکاتەوە وەك بڵێی قەت تەواو نابێ ، گۆشتی گوێلەکە ، گۆشتی بەراز ، شێخمەحشی هەمووی تیژاوی لەگەڵ دایە ، نە دەتوانی چەشنی ئەو دانە بنـاسی کە دەیخـۆلی ، نـــە دەشتوانی نەیخۆی !

ژنەکە تەبیات تیژو مزوڕە مۆنج دادەگری ..

جارێکیان بە ( کیرچ )م وت :ـ

ــــ : دەبێ ئەو تیژاوەی لەبێن بەری !

ــــ : بـۆ ؟

ــــ : چونکە سەبارەت بەوەوە گەدەم ئازارم دەدا ..

ــــ : راست دەکەی ، ئەمەش مانای وایە کەتۆ تووشی قورحـە

بوویت بەیانی دەتبەم معایەنەت دەکەم • ئەگەر تووشی بوو بی دەیبڕن •

ــ : بمبە ! بمبە بەڵکو بمبڕن •• چی دەبێ بابێ ، با بمبڕن با ، سکم هەڵدڕن ، بەڵام با لە تیژاوێم رزگار بکەن ،

جارێکیان حەزم چووە ئەوەی نەختێ سیرو خوێ بکوتمو لەگەڵ سرکە خۆراکێکی ئینسانی بخۆم ، ئەو ژەمە وەك دەرمانی یەك ساتە بوو بۆم لەدوای تیژاوی بەرێز ، دووبارەو سێ بارەم کردەوە ، بەڵام جارێ بەسەهوو چووم لەبیرمچوو پەنجەرەکان بکەمەوە ، دیار بوو دکتۆرەش بۆنی سیری کرد بوو ، وتی :ــ بۆنی چ کەلاشەیکە ئەم بۆنە ؟

نەمتوانی درۆیێ بکەم ، پێم وت : سیر •

ــ : جا سیر لێرە چی دەکرد ؟

ــ : ئۆ •• وەڵڵاهی چیت لێ بشارمەوە جنیمو خواردم •

( کورەکەم دەکوتم ) ••• چ هاتو هاواری نەکرد لەگەڵ ئەوەی پریشکیشی دەهاوێشتن ، نەی قیژاند ، ئەو بەو جۆرەش نی یە ئەوەندە سادەبێ •• هێمنو لەسەرخۆ دەپەیفی بەڵام بە شێوەیەك ، داغی دەکردم •

ــ : زۆرباشە ! بەخوا جوانە ، بەخۆو بە کیرچی ئەم ناو ماڵەمان لە چوار قوڕنەی دونیایێ کۆکردۆتەوە ، تۆش دێی بە

سیری گولاو پژێنی دەکەی ، کانتۆرەکە بۆگەنی کردووە، دارتاشێ بانگ دەکەم بیگۆڕێ ، ئیتر لەمەو دوا هەرگیز ناتوانم پێشوازی میوانان بکەم .

دوای کۆششێکی زۆر رازیم کرد کەنتۆرەکە تێک نەشکێنێ ، پێم وت : ئەمجارەش چاو لە هەڵەم بپۆشە ئیتر جارێکی تر چاوت بە سیری ناکەوێتەوە . با ئاشت بینەوە ! ئاشتی .. جا بۆ ئاشتی ؟! دوو جارانم بەشداری شەڕ کردووە ، جاری یەکەم لە پێشەوە بووم و لە جاری دووەمێشمدا لەگەڵ ئەوانەدا بووم کە ئازووقەمان بۆ کەتیبەکە رەوانە دەکرد ، ئەوەشت پێ بڵێم لە شەڕدا ، نە ترساوم و نە مردوویشم ، بەڵام دەتوانم بڵێم کە مرۆڤ دەشێ بە هۆی ( ئاشتی )یەوە لەسەرخۆ بمرێ . مەسەلەکەت بۆ روونتر دەکەمەوە :ـ

مرۆڤێ لە ماڵێ دابنێ ، وازی لێ بێنە بێ کارو کاسبی ، هەموو شتێکی بە تێراوێ دەرخوارد بدە باسی بایێی بە بارانێ بۆ بکە .. حەیاتی لێ دەبرێ ؟

بە کیرچم وت :

ــ : کە بۆ کردنەوەو داخستن دەچێتە لای بناوانێ ، هەندێ قەدی ( شۆرە بی ) م بۆ لەگەڵ خۆت بێنە سەبەتەی پێ دروست دەکەم .

کورەکەم وتی :

ـــ : تۆ سەبەتەی خۆتت دروستــت کـردووە ، بـۆ خۆت بـە
رەحەتی دانیشەو لەدوو ئەوەی بە کە بە چاکی دەزانی !

( بەرەحمەت ) بێ هەر لە دایکی دەکا ، قسەیەك دەکـا لـێی نایێتـە خـــوارەوە تەنانەت ئەگـەر چەنـد ساڵێـکیشی بـە سەردا تێپەڕ بوو بێ •• قسەیکی کرد لێی پەشیمان نابێتەوە • ئەو ئەندازیارەو تەنها لە ژماران دەگا ، (٢) لە لای ئەو هەر دەکاتـە (٢) ، سفریش هەر سفرە ، لەوەی زیاتر قسەی قۆڕە ••

( شەو شاد ، راکشێ بەڵکو خەوت لێ بکەوێ ) ! .
راکشێ بەڵام نەنووی ، هەر پاڵ دەکەومو ناکەوم هەســت بە گێژیو سەرسوران دەکەم •

با حاڵی خۆمانت بۆ بگێڕمەوە ! پێم دەڵێن ، بابە بۆچی ئێمە لەگەڵ ئەوەش وێکڕا لە جێگایکی دەژینو لەسەر یـەك خـوانیش دەخۆین لە یەکتری غەریبین ؟

ئێمە بە رادەیەك غەریبین لە یەکـتری ، کـە ئـەوان رازی نەبوون منداڵەکە بە ناوی من بکەن ، چونکە ناوی من ( ئیگنات )ە و منداڵەکانیش بە ( گاتیۆ ) بانگی دەکەن ، ناویان نا (کراسیمیۆر) •• ناوێکی نوێیە •

به باپیریتیان دەگوت ( گایتۆ ) ، باپیری باپیریشت ناوی ( گاتیۆ ) بوو ، هەردووکیشیان ژیانێکی پڕ خەباتیان لەگەڵ یاخی بووەکانی ( هایدۆت )دا بەسەر برد ، بە شداری گەلەك شەڕانیان کرد ، ناویّ گەیاندبووینەوە یەكو هەردووکیش بە نهێنی لایەنگیری شۆرشگێڕەکان بوون .. ئەوەتا ئێستاش نەوەکەیان ناوی دەنریّ ( کراسیمۆر ) . با لە نەوەکە بگەڕێین ، ئەوەتا باوکی وازی لە ( ئگناتۆن ) هێناوەو بووەتە ( ئیگناتیف ) ، تەنانەت لە دەلیلی تەلەفۆنیشدا نووسیویەتی : ئەندازیار (کیریل ئیگناتیف). زەنگی تەلەفۆن لیّ دەدا هەڵی دەگرم :

— : کێتان دەویّ ؟

— : هاوڕێی ئەندازیار ( ئیگاتیف ) !

که هاتەوە بەرەو روو پێم وت :

— : شۆرەتی خێزانەکەم ( ئگناتۆف ) ە ، ئەمەش لە مێژە لە دادگادا تۆمار کراوە ، لەبەر خاتری ئەم خێزانەیش چوویتە زانکۆییّو ئەندازەت خوێندو وات لیّ هات سواری ئۆتۆمبیل ببی ، ناوەکەی ترت لە کوێدا هێنا ، یا لە خێزانەکە بیّبەری دەبیّو لە رۆژنامەی رەسمیش بلاّوی دەکەیەوە ، یا ئەوەیە ناوم ناگۆڕیو بێزی لیّ ناکەیەوە !

گەلەك جاران جوابی داومەتەوە ، بەلاّم ئـەمجارە فزەی نەکرد ..

لەگەڵ ئەوەشا ئازایەتی من دادی نەوەکەمی نەداو ناوی هەر بە ( کراسیمۆر ) مایەوە •

جا ئەمە سەرکۆڵێکی بچووکە ، هی گەورەتریش هەیە کە جارێکیان • وەریان چەرخاند ، کونێکی ترسناکـی لـە هەستمدا کردەوە • ئەوێ شەوێ ، دوو سەعات بوو بێنی تەنگ کردبووم، لـە خـۆم دەپرسـی : بۆچی ماڵی خۆم لە گوندی بەجێ هێشتو هاتم گۆشەگیری ئەم قەفەسە زێرینەی بووم ؟ بۆچی ؟

بەڵام تۆ وەرە ئەوەی بە کوڕەکەم بڵێ ، کە پێم دەڵێ : چ دەکەی لە گوندێ بە تاقی تەنێ دەژی ؟

چۆن دەتوانم تێی بگەیێنم ، کە من لە ماڵێ دەبم لە گوندی لە دڵێ جیهاندا دەبم •

لە بێستانێدا گـێلاس و کولەکەو پیوازو تـەڕەو فێقی‌تر ••• شتێ خوڕەی دێ ، شتێکی‌تر هاشەی دێ ، سێیەم دەبۆڕینێ •

پێش ئەوەی بێمە ئێرە دوو بەرخم هەبوون ، دوو بەرخـی سپی جەربەزە ، فێر ببوون کە بە ماندوویەتی دەگاڕامەوەو لەبەر دەرگادا دەنیشتم ، لەشم ئارەقـەی لەبـەر دەڕۆیی ، لێم نزیـك بنەوەو بە زمان ئارەقەی بناگوێ و ملو هەرجێیەکی زمانی تێـدا بسوڕابایەوە دەیان لێستەوە ، لەگەڵ سوێریشی دەیان لێستەوە •• پفیان دەکرد ، دەیان لێستەوەو پفیان دەکرد ••• وەك بڵێی بـۆ

خواردنی قوربانیەکی پیرۆز ئـامادەم بـکەن •• هەردووکم بـــۆ کوڕەکەم کوشتنەوە •• تاکو ئێســتاش خۆم نەبەخشیــوە ، کـــە گوێیان لە کرانەوەی دەرگا دەبوو ، دەستیان بە باڕەباڕ دەکرد ، ئماع •• ئماع •• مماع •••

شتێکت لەبارەی دەرگاکە بۆ دەگێڕمەوە : چوارچیوەکەی کۆنە •• بەڵام قورسەو لـە داری مازوو دروســت کراوە ، کـە دەکرێتەوە جیرەی دێ ، کە دایشمدەخرێ سیرەی دێ •• هەندێ جار وەك ( خاتوون سێمانکە ) دەچریکێنێ هەندێ جاریش دەنگێکی کەرخی لێوە دێ •••

کە نەختێ دونیا شێدار دەبێ دەبۆڕێنێ ، کاتێ دەکەوینـە ناو گەرمایشەوە وشك هەڵدێو سیرەی تەواو لە ( ئارگۆن )ی دەستی دەکا •• منیش لە سیرەی دەرگاوە دەزانم ، کەی باران دەبارێو کەنگێ هەوا خۆش دەبێ •• تەنانەت وام لێهاتبوو بـە ئەندازیارەکەی کشتوکاڵم دەگوت : بەسە لاوە ! بەسە ، چیتر ئاوێ بە بنە مێوانەوە مەنێ •• سـبەینێ دەبارێ •• ئەندازیاریش وەڵامی دەدامەوە : بەڵام ئێزگە شتێکی دی دەڵێ ؟!

— : تۆ گوێ بۆ ئێزگەی خۆت رادێرەو منیش گوێ لە ئێزەگە تایبەتیەکەی خۆم دەگرم • دەشبینینەوە •• کامەیان راستتر دەردەچێ ؟!

وەکو منیش گوتم وا دەرچوو و باران باری ، لەو کاتەوە

وای لێهات سەرکارەکە دەهاتە لای من هەوای ئەمڕۆ و سبەینێم لـێ بپرسێ ..

ئێستاکە ئەو دەرگایە ژەنگ هەڵدێنێ .. نە کەس هـەیە بیکاتەوە ، نە کەسیش هەیە گوێ بۆ گوفتاری رادێرێ ، نە یاوەرو خەم ڕەوێنێکیشی هەیە ...

نامەیێکم بۆ ئاوەڵ زاواکەم ناردبوو ، پرسیارم لـێ کردبـوو خەبەرم بداتێ داخۆ ماڵەکە ، بەتایبەتیش دەرگاکە وەکـو خۆیـان ماون ؟ ... ئەویش ئەم نامە کورتەی خوارەوەی بۆ ناردبوومەوە :

« سلاوت لێ بێ ئاوەڵ زاوا !

چوومە تەماشـای دەرگاکە ، ئـەوا ئێستاش پێـت دەڵێم : دەرگا ساغو سەلیم هەر لە جێی خۆیدایە .. بەڵام نـە وەك جـاران گـۆرانی دەڵـێ و ... نە سیرەی دێ ... بەڵـکو وەك یەکێ بە ددانان جیرە جـیر دەکا ، وەك سـەگی پێـکراویش نسـکە نسکی دێ ..

سەرکار هەواڵت دەپرسێ ، هەروها خەڵکی گوندی هەموویان ، لێت دەپرسن .. »

نامەکەم دایە دەست کوڕەکەم بیخوێنێتەوە ، بەڵکو هەسـت بەوە بکا ، کە من پێویستیم بە ماڵێەو سووڕەی ناوك نیم بڕابمو فڕێ درابمە بیرێکی قووڵەوە ..

ئایا دەزانی چی پێ وتم ؟ :

ـــ : ئێوەی پیر وەك منداڵانن ، بـە دوای حەسانـەوەی خۆتان ناگەڕێن ، جا چ کەسێ هەبێ بە رووتانا بقیژێـنێ ، یاخۆد یەکێ بۆتان بژەنێ !

ـــ : ئاخ •• من ئێستاکە لە کوێم ؟ بڕۆ ڕێی خۆت بگرە ! ئەوا سیرو تیژاو وەك یەکیان لێهات ••

هەر چەندی نەیشتوانم قسەی لەگەڵ بکەم ، ئەدی قسـە لەگەڵ کێ بکەم ؟! لەگەڵ ئەوەشا حەزم لە قسەکردنە بەڵام نـــە جێگایێکی لەبار دەبینم ، نە کەسێ هەیە لەگەڵی بئاخفێم ••

دەستەی جحێلان لە باخچەکە دادەنیشن‌و قوماریێ دەکەن •• تـۆزێ دوور دەکەومەوە ، یەکـتری دەئامـێز دەگرن‌و بە ماچان دەکەونە بەر یەکتر •• تۆزێـکی دی دوور دەکەمـەوە منـداڵ‌و دایکان دەبینم ، ئێرە کەسێکی هاوتەمەنمی تێدا نییە ، بڵێی لەگەڵ ریزێ دابن یاخود دەیانبینی گەرما تەنگی پێهەڵچنیون ؟ نازانم •• بەڵام هیچیان نابینم ، لەوانەیە تووشی یەکێکیان ببم ، فەرمانبەرێکی بانق •• یا هەر بۆ نموونە ( باشـس کاتبێ ) ، بـەڵام تـۆزقاڵێ لـە قسەکانیانم بەدڵ نییە ••

جارێکیان لەگەڵ سەرتیپێکی خانەنشین‌دا پێك گەیشتین ، پێم وت : ئەم ساڵ وەرزی ڕەزان باش دەبێ ، باخەوانەکانیش بە

درێژایی رۆژێ ئاو بە باخچەکانیانەوە دەنێن ، کەچی ئەو باسی ( لازەر ) ی بۆ دەکردم : کە هەموو شتێ دەبڕێ :

— : ( لازەر ) تۆپ لەنێو دەبا •• ئەگەر زوو یا درەنگ جێگای دەگرێتــەوە ئـیتر تۆپ رەش دەبێتــەوە • پاشـــان ئــەوەی گێڕایەوە ، کە چۆن تۆپەکەی بەتالیۆنێکی (ئینگلۆفەرەنکسی) لەناو بردووە•• باسی تەقینــەوەی بۆمبای گــەورە گەورەیشی دەکرد ، داخی ئەوەیشی بوو بە کپی سەر دەنێتەوە !! وەك بڵێی ئەوەی کردبووی لە پەلەکووتەی دوا هەناسە زیاتـــر نەبووە !

ئەمە باسی شەڕی بــۆ دەکردم ، ئــەوانی دیــش بـاسی داوو دەرمـــان ، کەی چـاك بووەتــەوە و چــۆن سنــگیان بە مەلحەمێ شێلاوە •• یان ئەو پەڕۆکەی دینکۆفی پرۆفیســۆر بــۆی دانـاوە بەکاری بهێنێ •

یەکێکیان خەڵکی گوندی ( کراسنۆ ) بوو ناوی ( یۆگی یان یۆرگی ) بوو ، ئەوەی بۆ دەگێڕامەوە ، چۆن هەموو بەیانیـــان وەسەرو پۆڕی خۆی رادێ•• تاکو پتری خۆین لە مێشکدا بگەڕێ•• لەگەڵ ئەوەشدا کە رەنگ‌و روخسارت دەدی ، زەردهەڵگەڕاو ، ئەنانەت وات بە خەیاڵدا دەهات ، بە درێژایی ژیانی تنۆکە خوێنێکی بەسەردا نەگەڕاوە ! ملی قەد قەد ببوو ، چەناگەیشی دیار بوو ناوە ناوە دەلەریەوە ••

ئەگەر ئەو ( یۆرگی ) یەیان دەدایە دەستمو پێمەڕەینکم لـە دەست دەنـا ، ئەو کـات دەتبینی چـۆنی خوێـن لـە دەمارانـدا دەگەڕێ ••

لەبەر ئەوەی ئەم ساڵیش هەر لێرە بووم ، وام لێهات هەستم بە ئێشێك دەکرد لە کلاوەی چۆکمدا •• ئیتر هاوارم کرد : ئەی هاوار هەی خودایە خەریکم دەمرم ••! هەندەی دەرزی ئاژنم بکەن وایان لێ کردووم وەك بێژنگم لێهاتووە •• دەم ئێشێو قسەیش ناکەم •

جارێکیان ئاوەڵ زاوەکەم تێپەڕی پێمەڕەیکی پێ بوو :

— : بۆ کوێ ؟

— : پارچە زەوی‌یەکیان لە هەرەوەزیێ داوەتێ ، ئەوا ئێستاش دەچم تەختی بکەم ، ( وێنجە )ی بۆ پێچۆڵێ تیا دەچێنم ، بـۆ لەگەڵم نایێی ؟ وەرە چ دەبێ با ببێ •

لەگەڵی چووم •• کێڵگەکەمان تەخت‌کرد ، بژارمان کرد ، ئێوارە داهات ، منیش هیچ ئێشێکم تێدا نەما •• وەك بڵێی کەسێ بە دەست لێی دەرهێنابێو لەبن خاکی نابێ •

بە سەرۆکی کۆمەڵەی هەرەوەزیم وت : ئەوان ئاسا ، پارچە

زەوی‌یەکیش بدە بە من ، زۆر دەرد هەنە پێویستە پێی دەرمان بکەم •

سەرۆك وتی .ــ جا تۆ پارچە رەویت بۆ چی‌یە ؟ چیت پــێ چاکە ئەوی بــکە •• !!

بە سەرمدا قیژاند :ــ مێرگێکی بەردراوم بدێ ، ئەو وەختە پێت دەڵێم چیم پێ چاکە ••

ئەویش رێزی لێ دەنام ، چونکە من یەکێکم لەوانەی کــە بەشداریان لە دامەزراندنی کۆمەڵەی هەرەوەزیدا کردووە •

مێرگێکی دامێ ، بەڵام دەزانی لە کــوێ ؟ لە بــن کلــکی کسۆکی •• ، لە چۆلەوارێکی بەیار و بــێ ئاودا •• پێــش ئێستا مێرگ بووە ، وازی لێ‌هێنراوە زرەگیاو وشترالووکــی لێ شــین بووەو ، خاکەکەی خنکاندووەو زیانی پێ گەیاندووە •• ئیتر پێ‌ی بە سەردا نەهاتووە ••

من خۆم بە پلەی یەکەم باخەوانم ، لەگەڵ ئەوەشدا تەخسیریم نەکرد ، زرەگیاو بیژۆکم دانە دانە لێ بژار کرد ، برینمەوە •• لە رەگــەوە دەرم کێشــان‌و دوورم فــرێ‌دان • مێرگەکــەم پــاك کردەوە ، بەڵام لە رەگ‌وریشەی ( قرانیا )یێــك هەڵنــگووتم •• رەگی لە قووڵایی خاکدا گیر کردبــوو ، نــە دەهــەژایەوە ، نــە دەشبزووت•• گەلیکی بە دەسکەپێمەران لەگەڵ خەریك بووم ، بێ‌هوودە بوو• تەنیشتم کۆڵین•• بەڵام رەق‌و بەگرێ بوو توند توند خۆی بە خاکەوە گرتبــوو ، نەیدەویســت لــێ‌ی بیێتــەوە گشت لق‌وپۆپم برین ، لقێك نەبێ چیدی پێوە نەما ، لەگەڵ ئەوەشدا پێم دەرنەکێشرا •

یەکشەممەیێك بەگژی داچووم ، وەك ئەوەی بەگژ دڕندەیێك دابچم •• بڕیمەوە ، بن کۆڵم کرد ، هەناسەبڕ کێم پێوە نووسا کەفم هەڵدا •• ئاخری دەرم کێشایە سەر زەوی • ئیتر مێرگ کەوتەوە هەناسەدان • لە جێی ( قرانیا ) یەکەشدا ، دار گێلاسێکم لــێ چەقاند ، ( خۆخ و هەرمێ )یشم لێ رواندن •• تۆی سێپەڕەیشم کۆکردەوەو زەوی‌یەکەم پێ تۆدا •• ئاوم پێوەناو لێی گەڕام تــا شین دەبێ ••

لە جێژنی ( قەدیس قووستەنتین‌دا ) ، لەگەڵ ئاوەڵ زاواکەم چووین بژاری بکەین ، تــۆ بڵێ چیــمان بینی ؟؟ گوڵــە سێپەڕەو خەشخاش تێکەڵ ببوون ، بەری دارحەلوو کە سوور ببوو ، بۆنی گوڵان کە بەناو دارستان بڵاو ببووەوە ، ئاپوورەی هەنگ‌و مێشی دیکەی عاشق بە گوڵی بــۆخۆی راکێشابوو ، باڵیــان لێــك دەداو شیلەیان دەمژی ••

ئاوەڵ زاواکەم بانــگی کردم : دەی بــا دەست بــە بژاری بکەیــن • •

ـــ : بژاری چی‌و حاڵی چی ؟ ئەم مێرگە بژار ناکرێ ، وازبێنە با هەنگەکان گۆرانی بڵێن‌و سوپاسی ( گاتیۆ ) بکەن •

ئێواری بە سەرۆکم وت :ـ گەر دەتەوێ بزانی چیم پــێ خۆشە ، سبەینێ لەگەڵم وەرە دەچینە ناو مێرگەکە • •

سەرۆك رازی بوو و چووین •

ــــ : ئا ئەوەتا ، ئەوەی کە من پێم خۆشە جەنابی سەرۆك !

ــــ : ئەمە شتێکی چاکە ، بەڵام چاکتر دەبێ ئەگەر دێوجامەیێك لە شەرابی گەمزا ( جۆرە مەیێکی هەرە چاکی بۆنگارانە) بەبەر چوکلەی چاوانەوە بنرێ •• ئنجا لەسەر ئەو سێپەرەیەدا پاڵ بکەوی‌و قەڵێشت پێ بێ ، لەدەورو بەریشتدا ، قرچە قرچی کاریلەی برژاو بێ ، ئەو حەلە بە چاکی دەزانم چیت پێ خۆشە ••• چاکە ! من هەندێ چەورایم پێیە ••

دیاربوو ئەوەی پێی بوو دەری هانی‌و خواردی • پاشان بێ ئەوەی سەیری گێلاس بکات ، یا هەوایێکی پاك و بێگەرد هەڵمژێ لێی‌دا رۆیی ! ! بەم جۆرە وەك وتی وای نەکرد •• لەو ساوە من بیر لەوە دەکەمەوە کە پێم خۆشە •

جارێکیان بە کیرچم وت : هاورێی ئەندازیار ! پێم دەڵێی ئەوەی بکە ، پێت خۆشە ، داخۆ دەبێ ئەوە چی بێ کە خۆشی لێ دەبینرێ ؟

ــــ : دەپرسی چی‌یە ؟ ئەوەیە کە بنوی ، بچێتە سینەما •• دەشبێ ئەگەر کەسێ هەبوو لەگەڵی بکەی یاری (تەرنیف) ـ جۆرە یارێکی کاغەزی قومارە ـ بکەی •• بەڵام زەوق‌و میزاجی بێگەردیش ئەوەیە دونیات بە گونان بێ‌و لە کوێ پسا لــە وێی گرێ بدەیەوە •

وتم :ـ ئا ئەو زەوق‌و میزاجەی تۆ قسەی قۆڕە ! تــۆ

دەزانی ئەو سینەمایەی هەموو تێوارەیێ چاوی تێ نز دەکەیەوە چی‌یــە ؟ •

ئەوە وەکو ئەو دۆنە وایە کە بە شووشــەوە دەنووســێ •• سینەمای جوان ئەوەیە منی تیا دەژیم :: وە ئەمما بایەخ بەهیچ نەدەی ئــا ئەمەیان مردنە ••؟!

ـــ : شتێکی ئاسایی‌یە خانەنشین بیتو بحەسێیەوە و بایەخ بەهیچ نەدەی •

ـــ : نەخێر ئاسایی نی‌یە ئادەمزادی زیندوو بایەخ بە هیچ نەدا •• ئایا پەلکۆکەیێك لەم سرووشتەدا هەیە خانەنشین بێ ؟ نەخێر نی‌یەو نایشبێ هەبێ •• قەتت گوێ لێ بووە ، هەڵۆیــــێك خانەنشین کرابێ و هاتبێ لەدیار هێلانەکەی دانیشتبێ ، زاری بەش کردبێتەوە فەرخــە هەڵۆیــەکان بــە دەنــووك مشــکی دەرخوارد بدەن ؟

« هەڵۆ » تا دوا هەناسەی دەفرێ ئینجا بۆ زەوی کەڵەواژی دەبێتەوە ••

ئەوەم بۆ گێڕایەوە کە جارێــکیان لە نزیــك ( سپی‌یەئاو ) وەکەوە رووی‌دا :

« وەختی پشووودانی نیوەڕۆم بوو ، لە ژێر دارسنەوبەرێکدا پاڵ کەوتبووم ، بەرخەکانیش دەورەیان دابووم ، گوێم لە هاشەیێك بوو

بەسەرمەوە ، تەماشام کرد هەڵۆیێکم دی لە لای ( برسنەك ) دا دەهات تا دەشهات سەرەو خوار دەبووەوە تا گەیشتە سەرسەرم •• راپەریم ببینم چی بوو ؟ سەیرم کرد باڵەکانی لەسەر مێرگەکەدا جووت کردووە و حەیاتی لەبەر براوە بێ ئەوەی زامدار بووبێ یاخود نووکی دەخۆێن هاتبێ ••• مردبوو و دەشفڕی ••• ئا ئەوەیە شتی ئاسایی کوڕی خۆم لەکاتی فڕیندا بمری•• بەڵام تۆ لەو قەفەسەم بەند دەکەی ) دەمویست ئەوەی پێ بڵێم ، بەڵام پێش ئەوەی بیدرکێنم ، جوویمو قووتم دایەوە ••• »

کیرچ سەیرێکی کردم وام تێوەڕامابوو ، دەتگوت یەکەم جارە دەمبینێ •• ! وتی :ـ نەخێر •• دەتبەمە لای دکتۆرێك ، پێم وایە کە تۆ مێشکت نەخۆشە !

ـــ : لێم گەڕێ لەبەرو دختۆران ، چاکتر وایە بۆ خۆت بچیتە سینەما ! ••

وام زانی لە قسەکانم دەگا ، بەڵام دیار بوو تێی نەگەیشتبوو•• وشە بەگوێرەی ئەو وەك ژمارە وایە ، دوو هەر دووەو سفریش هەر سفر ••• !

من بەرەو مێرگی بەرفرەو کاکی بەکاکی دەچم •• ئەویش بەرەو بەغدا •• لەکوێ دەگەینەوەیەك ؟ ئا ئەمەیە سەری کۆڵیومو گێژی کردووم ، وێنەی دارکۆڵێ بەسەرمەوەیە ، دەسوڕێو دەسوڕێ تا لە ئاگرو ئارەقەمدا نقوم دەکا ••• رەپێ دەبم پەنجەرەکە بکەمەوە

هەوایێك بێتە ژوورەوە •• دەیکەمەوەو نایکەمەوەیش ، هاڕە هاڕو فڕە فڕی مەکینـان دێ : بڕبڕبڕ •• بربـوك •• قرڕڕڕ قـرر •• بووم •••

ماتۆڕەکان هەر مەڕسە لە شەقامەکەدا چ زیقە زیقیانە ، وەکو بڵێی زیقەیان لەناو دڵو گوێی پیاویدا دەچەقێ ، دەڵێم ئێستا کەڕ دەبـم ••

ژمارەی دانیشتووانی شاری ( تۆڵشاف ) خـۆی لە ملیۆنێـك دەدا ، پارێزگاریشی لێیە و تیپێکی تەواوی سەربازیشـی •• بڵێی کەسی وای تێدا نەبێ ئەو هەزار ـ تۆ بڵێ پێنج هەزار ـ ماتۆڕیانـە دوور بخاتەوە کە شاری تێك دەدەن و مرۆی کەڕ دەکەن ؟؟

پەنجەرەکەم داخستەوە ، سەرم خستە ژێر سنەوبەرەکە •• ئیتر لەوە زیاترم تا ئیستا بەدەستەوە نـەماوە •• شـتێکی دیکەشـم بەخەیاڵدا دێ ئەویش ئەوەیە هەڵبێم ••• تەنم حەزی لە هەڵمژینی بۆنی خۆڵی زیندووو گەرمۆکەیە ، چ قسەیش لەگەڵ کیرچ یا لەگەڵ بەفرگرەکە ( ثلاجە ) بکەی جیاوازی نییە ! بەڵام ئەمەش ئـەوە ناگەینێ کوڕەکەم خەرابە ، نەء ! ئەو بە دڵسۆزیو بە شـەرەفەوە ئیشی خۆی دەکا ، تەنانەت وا دێتە بەرچاو کە لە سکی دایکی نەبووە لە بەرمیلیدا هاتووەتە دەرێ ، هەر بۆیە بۆنی بنیـادەمی لێ نایێ ، پتر لەوەی بۆنی بەنزینی لێ دێ •• ئەوەنـدەی قسـەی بۆ بکـەم سوودی نییە ، وا ئەم پارچە کاغەزۆکەی بۆ دەنووسم :

« کوڕم کیریل !

ئەمن دەچمەوە گوندی ، ئەوان نەمامان دەگوێزنەوە له شوێنیتر بیڕوێنن •••• تۆ منت هێنایە شار لەوێم بڕوێنی ••• پیر بووم کوڕم •• من رەگ‌وڕیشەم لێرە نییە ••• رەگ‌و ڕیشەی من لەوێیە ، له گوندی • ئەوا منیش دەچمەوە بە دوای دەگەڕێم •• کە سیس دەبم‌و وشك هەڵدێم ، بەچاوی کراوەوە دەچمە نێو گۆڕەکەم •••

بمبورە رۆڵەم ! بە دوای منیشدا مەگەڕێ •• من بەرەو مێرگ‌و مێرغوزاری کاکیبەکاکی‌و فراوان رۆیشتم •• بەڵام تۆ ، تۆیش بەردەوام بە لە رێگەی خۆت بەرەو بەغدا •

باوکت : گاتیۆ »

# زنەوزنەی دەرویش

ئەوەی بۆتی دەگێڕمەوە لەدێــر زەمانــەوە رویداوە هێشــتا چواردەم لە تەمەنم نەبوارد بوو ، نە دایکم هەبوو نە باوك ، باوکمیان سەبارەت بە مانگانەکەی ساڵحەوە کوشت و دایکیشم بە ئیسپانیـــە تا مـــرد •

لە لای نەنك و باپیرێکی پیرەوە پەروەردە بووم •• دەســتی ڕاستی داپیرم ڕەق ببوو ، ئەمەش مانای وایە کەسێك نەبوو ئیش و کاری ماڵێ ڕاپەڕێنێ ••

باپیرم چاوی لە من بوو ، ژنم بۆ بێنێ •

لێی نەپرسیم ، جاران نەیان دەپرسی ، ئەوانەی ژنیــان بــۆ دەهات ، ڕیش سپیو پیرەکان لە ناوەخۆدا ئیشەکەیان دەبڕاندەوە •

جارێکیان گوێم لێ بوو پێکەوە دەئاخفین نەنکم وتی :

ــــ : هێشتا منداڵە !

باپیرم وەڵامی دایەوە : گەورە دەبێ ، گرنیگ ئەوەیە کیژێکی بۆ ببینینەوە !

باپیرم چی دیبوو و چۆن ؟ ئەمەیان کە ناتوانم پێتی بڵێم بــەڵام جارێکیان کە لە ناو مێرگدا گەڕامەوە بنیادەمێــکم بینی مەقەســتێکی گەورەی دەبەر پشتێ دا بوو ، باپیرم وتی :ــ رەمەزان ! ئەوا ئــەو بەرگدرووەم بانگ کردووە ، شەلوارێکت بۆ بدروێ ، جا رەنگاو رەنگت دەوێ یا ســادە ؟ لــەوەی زیــاتری لێ نەپرســیم ، بــۆیان خواســتم •• ژنیــان بۆ هێنــام لەوەی زیاتریشــیان لێ نەپرسـیم ( شەروالێکی ڕەنگاو ڕەنگ یا سادە ) •

چوارشەممە بەرگدروو هات ، پێنج شــەممە شــەلوارەکــەی تەواو کرد ، شەلوارێکی رەنگاو ڕەنگی خەت خەتو چنراو بوو•• رۆژی ( هەینی ) یش دۆڵنگێو هاتو کەوتە لێدانی تەپڵی زەماوەند، دۆڵ لێ دەدرێ و مەنجەڵ و قازانجی پر لە گۆشتیش کوڵە کوڵیانە ، منیش نازانم داخۆ دەبێ بووکەکەم کێ بێ ؟ بە شەرمەوە لە نەنکــم پرســـی :

ــــ : هاوسێیە ، یا هەر خەڵکی گوندییە ؟

بەڵام کێیە و چۆن دەبێ ، نەنکم شتێکی نەگوت ، منیش لــە سەری نەڕۆیشتم •• ئێوارە زانیم کێیە و چۆنە •• شێخ درووودی

مارەیی خوێندو تەپڵمان بۆ لێدراو پاشان هاتە سەر ئەو وەختـــەی پێکەوە لە ژوورەکەدا جێمان بێڵن •

باپیرم جودایی کردمەوە و وتی :

ــ : ئاگاداربە ، بەیانی خوێن هەبێ ! ئەگەر بووی بە پیاو ئــەوا وەك پیاوان بە •• گرنیگ ئەوەیە خوێن هەبێ دەنا دەبیتــە مەسخەرەی تەواوی گوندی ، پاڵێکی پێوە نامو دەژووریێ کردم و دەرگای کلیل دا •

نیو سەعات دەبوو وەك کۆڵکەدار دانیشتبووم بێ ئەوەی فزەم لێوە بێ یا ڕووپۆشی لە سەر لادەم پاشان هەر خۆی بە دەستی خۆی ڕووپۆشەکەی لاداو دەرکەوت • ، وام زانی باپیرم ئافرەتێکی قەڵەوو تێك چەقیوی بۆ هێناوم ، کەچی من کیژێکی لە وێنەی پەپوولەم دی ، سپی دەت گووت شیرە ، چاوی گەورە و سیحراوی •• بە سەرسامیەوە تێیەوە ڕامابووم ، ئەویش سەیری دەکردم •• پاشــان دایە قاقای پێکەنین ئینجا پرسی :

ــ : شەرم دەکەی ؟

ــ : ئەرێ وەڵلا •• ! !

ــ : شەرم لە چی دەکــەی ؟ شەڵوارێـکی ڕەنگینت دەبەردایـە سەیری ئەو پشدینە ، حەز دەکەی یاری بکەین ، بگەوزێین ؟ پێش ئەوەی پێی بڵێم کە داخۆ دەمــەوێ یان نا شـویتکی گرتم و بۆ خۆی ڕاکێشام و ماچی کردم و دایهێنامەوە •

بەم چەشنە چاکمان یاری کرد و ئاگامان لە خۆ بڕا ، هەستمان بە کەڵەبابی بەیانی نەکرد •• لەو دەمی‌دا کە خوێنەکەم بیر کەوتەوە کوڕنیشکم کەوتنە نێوچەوانێ « ئێستاکێ خۆشە ، بەڵام سپێدە دادێ‌و ئەوانەی لە خوێن دەپرسن دێن •• ئەدی ئاکام ؟ » بینیمی چیم بەسەر هات ، لێ‌ی پرسیم کە داخۆ بیر لە چی دەکەمەوە ؟

وتم :

ـــ : لە خوێن !

وتی : ـ بۆت پەیدا دەکەم •• ڕوومەتی پڤ دان بـوون بـە گوڵاڵە سوورە و تفنکیشی کۆڵینەوە خوێنی لێ پژا ••

لەوەی گەڕی لە کوێ و بە چیمان سڕیەوە ، هەموو شـتێ کۆتایی پێ‌هات ، وەك پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێـك‌دا دەژی ، لەگـەڵ سلیفیانادا ژیام ، ئەو کیژە ، بـەڵام هاوسـەرمە •• مێنە هـەر لـە منداڵێ‌یەوە ڕوخسـاری ئافرەتیان پێـوە دیارە ، جـا ئـەوە لەژێـر برزانگانیان دایە یا لەژێر نینۆکان ، گرنینگ ئەوەیە هەیە ، بـەڵام مەسەلەکە بۆ نێرینە جیایە ، ئەو پیاوەی کە ڕدێنی نـەبێ ڕوومەتی ئافرەتی پێ بخورێنێ پیاو نیە ! دلێش کە بیر لە ئافرەتێ دەکاتـەوە لەسەرو ڕدێنێ ناپرسێ کە ئەمەش لە خۆم ڕوویدا ، کاتێ لەگـەڵ سلیغیانا گەوزیم و لێك ئالاین و ئەوەندی پێمان کرا یاریمان کـرد ، دڵم هێزی دەهاتە بەر هێز ! کە ویستیشیان بە زۆرەملی ڕێ‌ی پـێ بگۆڕن ، لە ڕەگ‌و ریشەوە لە منیان دەرکێشا ، ئەوەش بێ ئەوەی

کەسێ هەستی پێ بکا ، هەموو شتێ وەك دەڵێن ئاسایی ڕۆیی ، وەکو ئەوەی لە سەر ئاوێ بێ وا بوو ، کەس نەبوو بۆ ئەوە بچێ کە لەوانەیە لەژێر ئاوەکەدا بەردێ هەبێ و قایەخەکەمانی تێ هەڵبنگوێ و هەلا هەلا بێ ٠

( سلیفیانا ) لەماڵەوە دەمێنێتەوە ، خزمەتی نەنکم دەکا و کە دەگەڕێنەوەیش زرۆبیو ناوساجیمان لەبەرێ دادەنێو ئیشمان دەکا ، گسك لێ دەدا ، تەنانەت ماڵە کۆنەکەمان وای لێ هاتووەوێنەی ڕۆژێ پرشنگان دەدا ، کۆڵەگەکانیش زەردە مسکە بوونەتەوە ، ( سلیفیانا ) بە گوڵ و گیای هەمەچەشنی ڕازاندبوونەوە ، وای لێ هاتبوو ڕۆژێ سێ جاران مینای پەنجەرەکەی تەڕ دەکرد و پاکی دەکردەوە و لەباتی ئاوێنە قژی لەبەر دادەهێنا ، قژێکی هەبوو لێرە زەردی دەنواند و لەوێ سوور وەك بڵێی گڕی تێبەر بووبێ ، کە لە لایێکی تر تەماشات دەکرد وەك زێڕی زیندوو وابوو، کەروێشکەی لە سەر سەری دەکرد ، دەست دەکاتێ دایدەهێنێ ، منیش دەچم تەماشای دەکەم و تێیەوەڕادەمێنم تا باپیرم بانگم دەکا :ـ

ـــ : ڕەمەزان هەستە ، بزنەکانت خەریکە لە برسان دەمرن !
ئای چ ئازارێکە بە دەست بزنانەوە ، هاوێنان خۆر تەمەڵێ دەنوێنێ و لە تاقی ئاسمانایە و ئاوا نابێ ٠٠ پێنج فلوسانیش ناهێنێ ، بووکی منیش لە گوندییە ٠٠

وام بە خەیاڵدا دێ بە گۆچانەکەم بکەومە بەر خۆرو پاشان

ختمی بکەم لە زەوی‌و ئیتر هەڵنەیێتەوە ، منیش بە گەنجی بمێنمەوە تا هەر شەو بێ‌و تا هەتایێ لە تەکیەوە پاڵ بکەوم یـا بـە هەناسەم برژانگی دابێنم ، فێر بووم هەموو بەیانیان کە لە خـەو هەڵدەستم فوو لە برژانگی دەکەم ، تاکو هەموو تاڵێـکی دەچێتـەوە جێی خۆی •

بەڵێنم بە (سلیفانا) دابوو کە لەگەڵ باپیرم دەچمە پیشانگایێ لە ( فلیبە ) شانەیێکی ئیسقانی بـۆ برژانـگان بـۆ بهـێنم ، کەچی بەڵێنەکەم نەگەیاندە جێ •

رۆژێکیان لەگەڵ باپیرم لە دروێنە بووم کە ئێوارە گەڕاینەوە ماڵێ ، چووینەوە سەر هەوارێکی خاڵی‌و تارو بێ بووك •

نەنـکم وتی ، براکانـی سلیفانـا داوایـان کـرد ، ئـەویش نەیدابوونێ و ئەوانیش پاڵێکیان پێوە نابوو و بردبوویان • وتبوویان سلیفانا جیازی هەیە و پێویستە وەری بگرێ سواری ئەسپێکیان کرد کە خەڵکیشیان گەیشتێ بەناو دارستانەکەدا بۆی دەرچوون •

نازانم چیم بەسەر هات ؟ بەڵام کە باپیرم بینیمی دەست بـۆ چەقۆیی دەبەم ، گرتمی و بە نەنـکمی وت : کندرێـکم بدەرێ ! نەنکم کندرێکی هێناو باپیریشم لە ئەستوونەکەی بەستمەوە و پێی وتم : تۆ دەبێ لە پێنـاوی زەوەززەدا خـۆت ڕاگـری •• نابێ بزووی دەمەوێ نەوەی حەسەن دەرویش لێرە گاگۆلکێ بکا ، پاشان

دەچی لە کوێ دەکوژرێی کەیفی خۆتە ! سواری ئێسترەکە بوو و بۆی دەرچوو ، بانگی نەنکمیشی کرد :

ـــ : ئاگات لە وەچەی دەروێش بێ ، دەنا سەرت دەقەڵێشمەوە !

نەنکم باپیرم چاك دەناسێ بۆیە دەستو پێی نەکردمەوە •

منیش وەك بلێی سەد ( زەروو )م بە دڵـەوە نووسابــێ و خوێنم بمژن ، هیچی ترم بە خەیاڵدا نەدەهات ، تەنها ئەو هیوایـە کزە نەبێ کە دەشێ براکانی بە ڕاستی بۆ جیازەکە بردبیانــەوە ، دواى ئەوەیش بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەوان براینە و غەریبـە نــین •

دڵی خۆم بەو تۆزە هیوایە دەدایەوە تا باپیرم لـەگەڵ مـەلا بانگدانێ هاتەوە ، زاری ئێسترێی کەفی هەڵدابــوو ، ئەوەندەی بەنێو زڵـکاوانیشدا تێپەرێ تەواوی بەدەنی تەڕ ببوو •

پاڵی پێوەنام و دەزوورێی کردمو دەرگایشی گاڵەدا ، لەگەڵ نەنکیشم چوونەوە ژوورەکەی خۆیان •

دیوارێکمان ناوبڕ بوو ، لە نێوەڕاستیدا دوکەڵ کێشێکی تێدا بوو ، دیوارەکە لەراستی دوکـەڵکێشەکەدا دەنــگی تیا دەهاتو دەمتوانی گوێم لە قسەو گفتوگۆیان بێ •

خۆم لە کونجێك ئاخنی و گوێم بۆ ڕادێران ، باپیرم بـــە دەنگێکی نزمەوە دەئاخفی ، بەڵام هەموو شتێ تێ گەیشتم دەیگوت:

ـــ : ئیتر بووك هی ئێمه نی‌یه ، برایه بێ ئه‌ده‌به‌كانی زانیبوویان هێشتا كچه ، بۆیه به دوو ( سابرێن ) انیان داوه‌ته ره‌فعه‌ت !
نه‌نكم لێی پرسی : ئه‌ی ئێستا ؟

ـــ : ئێستاش بردوویانه‌ته دارستان و كه‌س نازانێ كه‌نگێ ده‌گه‌ڕێنه‌وه ، به‌لآم چ سوودێكی هه‌یه بگه‌ڕێته‌وه و تۆوه‌كی بیژۆكی له هه‌ناوان دابێ .

نه‌نكم وتی : جا ئێستا چ ده‌كه‌ی ؟

ـــ : ده‌زانی چ ؟ وام به خه‌یاڵدا دێ كه ره‌فعه‌ت وه‌ك گولله له‌قیرپیدا ختم بكه‌م ، ده‌شیكه‌م ! به‌لآم ئێستا نا ، ژنێ بۆ ڕه‌مه‌زان دێنم و چاوه‌ڕێ ده‌كه‌م تاكو نه‌وه‌كه په‌یدا ده‌بێ ، جا ده‌زانم چۆن وا بكه‌م دایكی ره‌فعه‌ت خڕه فرمێسكان هه‌ڵبارێنێ .

قسه‌كانی باپیرم ، ئا ئه‌و قسانه‌ی وای لێ كردم كه خۆم به ئۆجاغه‌كه‌وه بنێم و نه‌بزووم و داوای لێ كردم به‌دیار خۆڵه مێشه‌وه بم !

له‌گه‌ڵ گه‌ردی به‌یانیدا باپیرم له‌گه‌ڵ شێخی هاتنه لام دڵی دامه‌وه ، تانه‌خنكێم و نوقم نه‌بم و تا دوژمنایه‌تی كه‌س نه‌كه‌م و له‌گه‌ڵ كه‌س به داوانه‌یێم ، هه‌ر بۆ ئه‌وه‌ی نه‌وه‌یه‌ك بۆ باپیرم به‌جێ بێڵم پاشان خوای ده‌كرد سه‌رم پان ده‌بووه‌وه !!

ئه‌و ڕووداوانه‌ی كه له دوایشدا هاتن ، بێره ، به ناو دڵم دا چوون .. وێنه‌ی كۆمه‌ڵه تابلۆیێك .. ئازاریان ده‌دام .. تابلۆی

یەکەم کە سلیفیانا گەڕایەوە گوندی ، ماڵی ڕەفعەت هاوسێمانن ، ناوبڕمان تەنها دیوارێکە ، بـەڵام کە گەڕانـەوە کەس نەیدیتن ، مانگێك بلێ زیاتریشی پێ چوو بوو پێیەوە دیار نەبوو ئەم دەڵەکە جووتبێتی •• ڕوومەتی وەك هەویر شێلا بوو ، زاتی نەدەکرد ئەمە بلێ منیش هەموو شتێکم دەزانی ••

لە یەکەمین ڕۆژەوە ڕەفعەت عاشقی ببوو ، کاتێ کە لـــە حەوشەی دیبوو دێ و دەچێ ، کونێکی لە دیواریـدا کردبوو و تەماشای دەکرد ، ئەو بە حەفت ساڵان لە من گەورەترە سەرەرای ئەوەیش لە خۆشیان دایە ، ناچێتە داران‌و ناشچێتە کـێڵگە ، تەنهـا یارمەتی باوکی دەدا ، باوکی گۆشت فرۆشە • عارەقێ دەخواتەوەو ددانان دەگرسێنێ و پاشان دەچـێ سـنگ دەردەپەڕێـنێ و فشـەو فەخفەخە بە خەڵك دەفرۆشێ ••

ماڵی ڕەفعەت دوو سابرێنی قەڵەویان هەیە دوو زەنگوڵیان بـە ملی‌یەوە یە ، کە دەزرنگێنەوە لەپشت دە گردانت گوێ لێ دەبن ، براکانی سلیفیانا ( ڕەجەب و یومێر ) تەماحکارن ، شوانکارەشـن و حیساب بۆ سابرێن و زەنگوڵان دەکەن ، جلەویان بۆ ڕەفعەت شل کردووە، ئەوان سابرێنەکانیان دەوێ ئەویش خوشکیان، زانیبووشیان هێشتا کچە دەقەبەڵیان کردبوو •

زۆرم حەز دەکرد سلیفیانا ببینم ، بەڵام ئەو زاڵمە لە پشـت قفڵێی نابوو چ ڕێگایەك نەبوو پێی ببینم ، جارێکیان غەریبیم بۆی

هەستا ، هەر تاریك‌دا هات بەسەر بانەکە کەوتم و چووم لــە پەنا دوکەڵ‌کێشەکەوە خۆم حەشاردا ، لە پەنجەرەی ماڵی رەفعەتەوە سەیرم دەکرد ..

پەنجەرەکە خڕە ، لە ناوەوەشدا لامپایکی نەوتی دەسووتێ چی لە ماڵدایە دیارە ، هەمووی نا .. بەڵام دەمدیتن لەبەر خوانەکە دادەنیشن ، پاشان دەمــدیتن هــەڵی دەگرنــەوەو رەفعــەتم دەدی پشتی دەکردەوە و خۆی تەنها دەکردو ... و ... ؟ نەمدەتوانی چاوەکانی بینم ، بەڵام سەری وەك بڵێی بڕابێ دەلەنگیەوە ئەویش دەیگرت‌و هەردوو پەنجەی گەورەی دەخستە ژێر چەناگەی‌و وەك دڕندە هەڵی دەلووشی .

لامپاکە دەسووتاو دڵی منیش وێنەی مۆم دەتوایەوە .. ئەم دڵە چۆن نەتوێتەوە ؟ چـۆن نەوەسـتێ ؟ چـۆن بـگاتە سبەی‌و دوو سبەی ؟!

نەنکم هەستی بەوە کرد خۆم لە پەنای دوکەڵکێشەکەوە دەنێم بە باپیرمی گوت ، ئەویش دیار بوو سەرزەنشتی کردو وتی :

ــــ : با بکا ، چ دەکا با بکا .. با ڕق بخواتەوە ، با پڕبێ لــە قین .. با فێر بێ خوێنی ئافرەت لە لووتیەوە وەر نەگرێ !

بڵێی باپیرم راستی‌کردبێ یان نا ؟ ناتوانم حوکمی ئەوە بدەم ، بەڵام ئەوەی پەیوەندی بــە ڕقەکەوە بــێ کارەسات بوو .. کە حەزت دەچێتە شتێك ، بیر لە چیتر ناکەیەوە ... بووکۆکەی

پڕ لەپووشت دیوە ؟ هیچی تیا نی‌یە ، نە دڵ ، نە ئێسقان تەنها پووش‌و بەس من وەك ئەو بووکۆکەیەم ، بەڵام پووشی من رق‌و کینەیە ، هەر بە وەیشم خۆ لەسەر پێ‌یان ڕاگرتووە •

ئەو ڕقەی لە رەفعەتم دەبێتەوە ئەوەتا بەسەرمەوەیە ، لە ناو نوێنیٚ ، لە کێلگەشدا لەگەڵمایە ، شەو و ڕۆژ •• خەیاڵی ئەوە دەکەم چۆنی بە تەورداسیٚ دەبڕمەوە یا بە خەنجەریٚی دادەڕسێمە هەناوان، ئەویش دەم‌ودەست نامریٚ‌و پێوەی دەناڵێنیٚ ؟ ڕیخۆڵەکانی لەسەر ئەرز بەدوای خۆی ڕادەکێشیٚ ، منیش بە پێیان پانیان دەکەمەوە و بە نینۆکان لەباڵ یەکیان دەردێنم ، بیٚ ئەوەی بەمەیش دڵم ئاویٚ بخواتەوە ، بە خەنجەریٚ ئازاری نابیٚ ، بیرم لە ئازاردانێکی دیکە کردەوە ، بیرم لەوە کردەوە لەسەرخۆ بیخنکێنم، ماوەی بدەمیٚ ، بەڵام ئەوەم لا ڕوون بوو ، ئەگەر بیگرم بەری نادەم بۆیە خنکاندنەکەیشم بەدڵ نەبوو ، ئازارو ئەشکەنجەی ترم داهێنا سیٚ سەد جارم کوشت‌و ژیاندەمەوە •

سەرم گڕی گرت ، کوشتمەوە ، لەت لەتم کردو کردم بە هەزار پارچە ، دەستم شل بوون ئەوجار بە ددانان ، تاکو ئاخری پووشی ناو بووکۆکە گڕی گرت و منیش تام لیٚهات ، لێوە لەرزەم گەیشتیٚ‌و نەخۆش بووم ، کەوتمە ناو جیٚ‌یان •

ئەو وەختە باپیرم تەنگاو بوو ! لەبەر من نا ، لەبەر وەچەی دەروێش ، لەگەڵ خۆی بردمە « تریگراد » بۆ لای ئایشەقەڵەو ••

ئەویش زۆری دەرمانی تاڵ دامێو بە زۆر مەلحەمانیشی چەور کردم ، ئیتر تایەکە بەری دام و حەفتەیێکی پێنەچوو چاك بوومەوە • بەڵام باپیرم نەیهێنامەوە گوندی ، لە « تریگراد » بەجێی هێشتم ، لەوێ لای بزنەگەلی ( دیلیۆمێر ) ، ئایشە قەڵەویشی ڕاسپارد چی پێ باشە بمداتێ بە مەرجێك بێ سمێڵ و ڕدێن نەگەڕێمەوە •

هەر وایش بوو ، جا ئەوە بە هۆی تاڵاو بوو یا لەبەر ئەوەی چونکە بەناو ساڵان کەوتم ـ هەر ماوەی چەند مانگێك بوو سمێڵو ڕدێنم پێوە هاتن ، کەس نازانێ ئەوە چ ڕدێنێکە ، بەڵام بەهەر حاڵ ڕدێنە ، ئەمەیش نەختێ هێوری کردمەوەو رزگارم بوو لەو دەردە بەرازەی و ڕۆیم بە دوای ئارەزووی خۆم کەوتم ••

باپیرم هاتو وتی : یاڵڵا با ژنت بۆ بێنین خورێ خورێم کەوتۆتە دەستی و شینێ بە دایکی رەفعەت هەر دەگێڕم !

بە باپیرم وت : دەتوانی ژنێم بۆ بێنیو چم لێ دەکەی کەیفی خۆتە ، بەڵام تخوونی رەفعەت ناکەوی من خۆم حیسابی لەگەڵ پاك دەکەمەوە •• سوێندیشم دا کە بە قسەم بکا •

ژنم لە تزیگراد هێنا ، ئەمجارەیان چ فرۆفێڵی تێدا نەبوو ، هەموو شتێ بەرکەماڵ بەسەر چوو ، منداڵەکەم بوو ، بەڵام نەك بە نۆ مانگان ، بە حەفت مانگان ! دیارە زانیوویەتی باپیرم ئەوەندەی لێ بەساتی‌یە و پێشی وادەی بوونی کەوتووە !

چەند ساڵ بوو باپیرم نەدیبوو پێبکەنێ ، ئێستا بینیم ••
گرژیەوەو ڕاکشا بمرێ •• بەڕاستیی ڕاکشا هەر دوای سێ
ڕۆژان پاش لەدایك بوونی منداڵەکە ، دەمی داچەقی و کەوتە سەر
جێیان ، بڕۆی چەپەی بەتەنێ هەڵدەتەکێ ، بانگی کردم و
وتی :ـ ڕەمەزان کوڕم ! خۆ دیتت ، باپیرتم ها ! زەوەززەی
دەرویش ؟؟ ئەوەتا ئێستایش دەڕۆم مزگێنی بدەمە باوکت ، بەڵام
( رفعەت ) ، ئەوا ئەویشم بە تەمای تۆ کرد !

باپیرم ئەمەی وت‌و بەدوایی بوو ، ژن و منداڵێك‌و ڕەفعەتیشی
بەتەمای من بەجێ هێشت ، دە وەرە جا ڕەمەزان بزانین چۆن سێ
شتان بە دەستێکی هەڵدەگری ، ژن و منداڵێك و دوژمنیش ، تۆی
کە پووشی بووکۆکەت تێدایە ، دەبێ ڕاست ڕێ بکەی و بزنەکانت
بلەوەڕێنی و بکێڵی تا بخۆی ، وە ئەمما جەرگ و دڵت ئەوەتان
لە لای قەسابی ، ڕەفعەت چۆنی بوێ وای دەگووشێ •

لەبەر خۆمەوە دەمگوت : پێویستە منداڵەکەم هەراشۆکە بێ
کە دایکی بتوانێ پەروەردەی بکا ، ئەو دەمی سکی ڕەفعەتت بۆ
هەڵدەدڕم ، لە دوایشدا وتم چاوەڕێ دەکەم تا ڕەپێ دەبێ و
دەڕوا •• کە ڕۆیشتیش وای لێهات سلیفیانا بەدەر دەکەوت ،
منداڵێکیشی دەئامێزێ دابوو و پەچەی لە ڕووان دابوو ، وەك جاری
جاران هات‌و چۆی لە حەوشەکە دەکرد ، دیار بوو نەی دیبووم ،
بەڵام چاوی لێ دەگێڕام بمبینێ •

کونێکم دە دیواری ژوورەکەیان کرد و سەیرم دەکرد ، کاتێ کە من لە ژوورەوە تەماشام دەکــرد ، رەفعەت لــە پەنجەرەکەوە چاوی لێ بوو ، ژنەکەیشم چاوی لێ بووم ، لە بەختی من ژنێکی شەڕانی نی‌یە ، نە هاواری کرد و نــە حەفــتو هەشیتشی لەگەڵ کردم ، چوو بێ هەستو خوست فرمێسکی هەڵدەباراندن ••

بەم چەشنە رۆژگار هاتن‌و رۆژگار ڕۆین •• جۆتی دەکەم‌و کارێزان لێ دەدەم ، یا نەخۆ لەگەڵ بزنان‌دا دەبم ، بە پەلەشـــم ، پێش ئەوەی تاریك دابێ دەگەڕێمەوە بەو کوونەوە دەنووسێم کە لە دیواری ژوورەکەدا کردوومەو چاوەڕوانــی سلیفیانــا دەکەم ببینم جا ئەگەر ببینم ئەوا دڵم دادەمرکێتەوە ماندوویەتیشم دەرەوێتەوە ، ئەگەر نەیشی‌بینم ئەوا شەوێ بە ددان گرساندن بەڕێ دەکــەم •• کەوڵی دەکەم ••• دەیخنکێنم ، دەرمان خواردی دەکەم ، لەگەڵ ئەوەشا دڵم قەرار ناگرێ !

زۆر جارانم داناوە تەواوی بکەم ، بەڵام هەر کە بیر لــەوە دەکەمەوە دەچمە زیندان‌و لەوێشدا هیچ کونێك نی‌یــە سلیفانای تێدا ببینم ، وازی دێنم‌و پەشیمان دەبمەوە •

ئا بەم جۆرە ژیانم دەڕۆیی ، رۆژ لەدوای رۆژو ساڵ لەدوای ساڵ ••• ئەگەر منداڵم گەورە نەبوونایە و شوویان نەکردبایە و منداڵیان نەبووایە ، نەمدەزانی چەند ساڵ تێپەڕیون •

ناوبڕی نێوان ئێمەو ماڵی رەفعەت لەدار گڵوانی‌یە و لە باڵ

یەکدی چووەتەوە ، ئاوایش ئاسان نەبوو هەموو ئێواران بە بەفرو مەیی سەرخۆش ببێ و بەیانیانیش لەگەڵ شەختەدا رابێ •• زۆر زۆری خواردۆتەوە و وەختی داهاتووە گلۆلەی بکەوێتە لێژیەوە •• قەسابخانەکەیشیان لە ستاندوە ، بەمەیش زیاتری بێن تەنگ بووە••• ئەگەر دەرزی ئاژنیش نەکرێ ، ئەوا مەی وێنەی دەرزی تێ ی دەچەقێ • مەی پشتی شکاندوەو فڕێ ی داوەتە سەر جێ یان •• کچەکانی شوویان لە گوندێکی تر کردووە و خۆی و سلیفانا بە تەنها ماونەتەوە •

پێلەقەیێکم لە ناوبڕە هەڵوەشاوەکەدا ، وەك ئەوەی بچمە ماڵی خۆم ، چوومە حەوشەی ماڵی سلیفانا ، نەختێ بە حەوشەیشدا بۆ ژووری رەفعەت تێپەڕیم ، لەوێ لێ ی دانیشتین •

چل ساڵ دەبێ یەکەمین جارە کە ئێمە هەرسێکمان لە یەك جێگادا کۆدەبینەوە و یەکەمین جاریشە بەرەو روو دەڕوانمە رەفعەت و سلیفانایشمان لە بەیندایە •••

( فکرم پیسە گەورەم با پێت بڵێم !• ) ، حەزم دەکرد بەبەر چاوی یەوە سلیفانا لە ئامێزێ بگرم و لە باوەشمدا بیبینێ وەکو چۆن من بە درێژایی ژیانم لە باوەشی ئەومدا دیوە •••

بەڵام ئەو قبوڵی نەکرد :

ــ : ئەوەندە بەسە کە لێرەین ، ئەگەر ئەو زاڵم بووبێ ، تۆ وا مەبە !

دەپرسی ئەدی ئێستا ؟ ئێستاکە کار بەم چەشنە دەڕوا :

رەفعەت سەرمای دەبێ •• سلیفانایش کەری نی‌یە پێی بچێتە داران و ئاگری بۆ بکاتەوە و سۆبەی بۆ تێ باوێ •• مـن دەچم !! هەموو رۆژێ باری کەرێك دار دەهێنم و بەشیش ناکا •• یاساوڵەکانی دارستان بینیمیانو لێیـان نووسـیم ، دوایشم کەوتن بمگرن و جارێکی ترم لەسەر بنووسن •• هەلاتم •• بۆیە ئێسـتا بەشەو دەچم و بەو چاوانە سەیـریان دەکـەم و بـەو دەستانەیش دەیانبرم تاکو یاساوڵەکان دەنوون ، ئینجا دارەکان بە نێو دۆلەکەدا دێنمو بەرەو ماڵ دەکێشمەوە • بەلاّن چی ؟ لەرێی ئەوەی کە ئاگری بەرداوەتە رۆحم لەشم تێك شکاوە !••

ئاگریش دەکەمەوە ، ئەوەی پێ گەرم دەکەمەوە کە وای لێ کردم ، چڵ سالاّن ، تاوێ لە نێو ئاگرو تـاوێ لەنێـو شەختەدا بژیم •• نەمدەتوانی واز بهێنم ، کە وازیشم هێنابووایە دەبووایـە سلیفانا خۆی بچووبایە داران •• بانگم دەکا یارمەتی بدەم •• دەستم پێ لە ئیش هەڵدەگرێ ، چونکە چاکیش ئالیك دراوەو قورسە ، لە پاك کردنەوەی جێو بالنگانی و عەیب نەبێ پاشەرۆك ، پێویستی بەوە هەیە بلّند بکرێ ، ئەویش ئافرەتێکی لاوەزەو ئەو هەمـوو ئیشانەی پێ ناکرێن •• کەواتە کێ ئەم کارە بکا ؟ کێ ؟ ئینجـا وەرە رەمەزان ئەوجار خزمەتی رەفعەت بکە ؟؟!! کە خزمەتیشم دەکرد هەر بۆ ئەوەبوو بارەکە لەسـەر شانی سلیفانا نـەبێ •••

بیستمەوە لە گەرکێ باس دەکەن : ( تەماشــا ، تەماشا •• چــۆن هاوسێیەکە ! چ ئینسانێکە ؟ •• ) بــەڵام ئــەوان ناوەوەی مــن نابینن چی تێدایە براینە هەناوم زووخاوی تیا دەکوڵێو دەکوڵێ •• منیش چاوەڕێی مردنی رەفعەت دەکەم تاکو سلیفانا مارە بــکەم ، کەچی ئەو نابووتەیش نامرێ•• ئا ئەمیشە زووخاوی زووخاوان•• دەمەوێ پێکەوە لەژێر لێفەیێکدا بنووین ، وەك پیاوێ کە لەگەڵ ئافرەتێکدا دەنوێ •• پاشانیش چ دەبێ با ببێ ••

ژنو ماڵو منداڵم بەجێ دێڵم و دەچمەوە لای •• بەڵام ئــا ئەوەتا رەفعەتە شەپڵەلێدراو کڕو کپ لــە نێوانماندا کەوتــووە ، ئەوەتا کاتیش دەفڕێ و ئاوی چۆکانیشم دەچێ و ناشزانم داخــۆ لەگەڵ سلیفانا وەك ژنو پیاو لەگەڵ یەك دەنووین یا وەك خوشكو برا کەس حەقی بەسەرمانەوە نابێ ••؟

زۆر جار دەڵێم : ئــەو هــەر بــە ئازارە ، ئێمەیش لەگەڵی مردووین •• بۆچی دەرگای ژوورەکەی ، کە ئەوە دوو ساڵـــە دایخستووە لەسەر واڵا نەکەمەوە •• نە دەیخنکێنم و نە نوقمیشــی دەکەم •• دوو سێ شەوانی لەبەر سەرمادا لێ دەگەڕێم کاری لەکار دەترازێ •• بیرم ئا لەوە کردەوە ، بەڵام ئیــتر ئــەم کارەکەی براندەوە •••

روانیم سلیفانا تەماشام دەکا •• لێی گەڕامو ڕێی خۆم گرت بەرەو دارستان بچم داری بۆ بهێنم ••! لە دووریێیانیدا لێم تێك دەچێ ••

ڕێگام پێشان بدە ! گەر دەتوانی ڕێنمایم بکە ، یانەخۆ یارمەتیم بدە ئەو دارانە لەکەرێ بنێم و بڕۆم •• ددانی ئەو نابووتەی تێك دەچەقێ و چاوەڕوانە •

# ڕێگاوان

دوێنێ یەکێك لە بەرێوەبەرایەتی ڕێگاوبان هاتە لامو پرسی :
ئلاشۆ کی‌یە ؟
وتم : منم .
وتی : سەرۆك دەستووری پێداوم بۆ لای ئەوت بەرم .
بەپێشەخۆی دامو ڕێگامان گرتەبەر .. بردمی تاکو گەیشتینە پێش ژوورەکەی سەرۆك
لەوێدا وتی : کلاوەکەت داکەنە .. لەدەرگا بدە .. ئینجا بڕۆ ژوورەوە .
کلاوەکەم داکەندو لەدەرگام داو چوومە ژوورێ .
سەرۆك لە پشت مێزەکەیەوە دانیشتبوو ، ڕۆژنامەیکی بە دەستەوە بوو دەیخوێندەوە .
وتم : ( سەلامو عەلەیکوم ) جەنابی سەرۆك .
هەر بەدەم ڕۆژنامە خوێندنەوەوە لێی پرسیم : چیت

دەویٚ ؟

وتم : من هیچ عەرزێکم نی‌یە ، ئێوە منتان داوا کردووە ، مـــن ڤلاشــۆم ، کە وتـم ڤلاشــۆم ، ڕۆژنامەکەی داناو ڕووی تیٚ کردم :

ـــ : ها !! ، ئەوەتۆی ڤلاشۆ ؟ ، کەواتە تۆی لە دەرەوەی شاردا بەخۆڕایی ڕێگەوبانان دروست دەکەی ؟

وتم : بەلیٚ مــنم :

پرسی : تۆ خەڵکی ئەم شارەی ؟

وتم : بەڵیٚ قوربان .

( ســەری لەقــاند )

ـــ : سەیرە ! کە من تۆم نەدیوە ؟!!

وتم : شار گەورەیە قوربان ، منیش کەم وەدەردەکەوم ... لـە ماڵەوە کاردەکـەم ... کـەوش چـنم ، قـوربان ڕاستر پینەدۆزم !!

( سەری ســـوڕما )

ـــ : پێڵاو چنیٔو ڕیٚدروستکردن چۆن دەبێت ؟!

وتم : مەگەر قەدەغەیە قوربان ؟

( پێـــکەنی )

ـــ : نەء ، من بۆ ئەوەم نەپرسی .

بۆم ڕوون کرددەوە کە خزمەتکارەکەی دەستووری پێدام دەمهێنێتە لای سەرۆك •• منیش وتم خوانەخواستە بڵێی کەسم دەم کوت کردبێ ؟!!

( خۆی وێك هێنایەوە ! )

— : ئەحمەق ! من نەمگوت تۆ بهێنێ ! وتم تکا لی بکات سەرێکم لێ بدەی و یەکتری ببینین و نەختێ بە گاڵتەو گەپ و قسەی خۆشەوە رابوێرین ، ئەگەر پێویستیشی کرد لەباتی ئەو (رێ)یانەی دروستیان دەکەی پارەت بدەمێ •

وتی : من لێرە بەرپرسیاری رێگاوبانی دەوڵەتم ، بڵێ چەندت بدەمێ ؟

وتم : جەنابی سەرۆك خۆ من بە پارە (رێ)یان دروست ناکەم ! ( بەقسەکانم تووڕەو گرژ بوو •• هەستایە سەرپێ ! دەستی رادەوەشاند ) : —

چۆن بەبێ پارە دەبێ ؟ دەوڵەت رێگا نادا کاربکەی ، دەبێ پارە وەبگری •

( تۆزێ لەجێی خۆم بزووتم )

وتم : باشە کەوایە ، پارەکەم بدەنێ •

پرسی : چەند ؟

وتم : حیسابم نەکردووە چەند دەبێ •

( سەری سورما ! )

ـــ : چۆن حیسابت نەکردووە چەند رۆژانت ئیش کردووە ؟..

وتم : رۆژەکانم نەژماردووە ، ئەمن تەنها پاش نیوەرۆیان ئیش دەکەم .

وتی : ئەدی پێش نیوەڕۆ ؟

وتم : پێش نیوەڕۆیان پێلاو چاك دەکەمەوە .

وتی : لەوکارەدا چەندت دەست دەکەوێ ؟

وتم : شەست ( لیف ) .. هەندێ جاریش وایە دوو ( لیف ) ، نەمکێشاوە بە تەرازوو ! ژنەکەشم یارمەتیم دەدا .. ئەویش لە چێشتخانەدا کاردەکات ، قاپو قازانیان بۆ دەشوات ، خواردنیش هەر لەوێ دەخوا ، کوڕەکانیشم گەورەبوون‌و ژنیان هێناوەو بەجیادەژین .. سەرۆك واقیورمابوو . . تەنانەت چاویلکە کەیشی دەچاوی کرد تاکو چاترم ببینێ .

وتی : زۆر چاکە .. بەڕاست زۆر بەتەمەنیش دیار ، نادەی ؟

وتم : هەمووی ، هەمووی با ( شەست ) ساڵ بم .

پرسی : هەموو رۆژێ لە رێگەو بانان‌دا ئیش دەکەی ؟

وتم : ئا .. هەموو رۆژێ پاش نیوەڕۆیان .

ـــ : چ جارێ پارەت وەرنەگرتووە ؟

وتم : جاپارە لەکێ وەرگرم ؟ کەس نامداتێ ، مـن خۆم حـەزم لێیە (رێ)یان دروست بکەم، کەس بە تۆبزی پێم ناکات..

بۆپاره وەرگرم ؟ تەنها جارێ تەقاویتەکان ناچاریان کردم رێگایەك بۆ باخچە چکۆلانە کەیان رابکێشم ، بەڵێنیشیان دامێ کەرێگاکەم تەواوکرد لە ناوخۆیاندا هەریەکێ دوو (لیف)م بۆ کۆبکەنەوە، کەچی رێگایش تەواوبو بەڵێنەکەی خۆیان بەجێ نەهێنا .

سەرۆك لێی پرسیم : ئێستا کەوایە دەتوانی باریکەرێیەکمان بۆ دروست بکەی ؟

وتم : دەتوانم ، بۆ ناتوانم . ؟

پرسی : چەندت پێویستە بتدەمێ ؟

وتم : هەرچەندی دەیدەی ؟

پرسی : ئامرازومامرازی تەواوت هەیە ؟

وتم : بەڵێ ..

وتی : ئامرازی تەقاندنەوە ؟

وتم : کەرەستەی تەقاندنەوە .. بۆ من چ کەڵکێکی هەیە ، من ئیش بە باروت ناکەم !

وتی : بۆ ؟

وتم : یاروت دارستانان دەلەزرێنێ ، بەباڵداران وەدەدا ..

— : باشە ئەدی چ لەگەڵ ئەو تاشەبەردو کەرتە چیایانە دەکەی کەرێگات لێدەگرن ؟

وتم : دووریان فرێ دەدەم .. یانەخۆ بەکۆلنگ دەریان دێنم ..،

ئەگەرنا دوور دووریان فڕێ دەدەم •• ئەمن بەرد دەناسم دەزانم چ بەردێك ریشەدارەو کامەیش بێ ڕەگ‌و ریشەیە •• وتم : بەرد هەیە تەکان ناخوا ، ڕەگی نیە ، مرۆڤ نازانـــێ لەکوێیەوە بیگرێت ••

وتم : بنیادەم‌و بەردی بێ‌ڕەگ دەوای دەردان ناکەن نەبەکوڵنگ‌و نەبەبێڵیش دەتوانرێ تەکانیان پێ‌بخورێ ، تەنانەت کـــە تەنیشتانیشیان کلۆردەکەی تەکان ناخۆن ، باکیان پێ‌نی‌یـە کە (ڕێ) دروست دەبێت یانابێ!! بۆیەمنیش کراسێك بەخۆوە نابینم کە ئارەقەی ئەو ماندووبوونەم هەڵمژێ •

( ئامۆژگاری کردم ) •

ــــ : چاکە ، ئەم ئیشەمەکە ! ،( ! دوای ئەوە وتی ) : بیستم ئەو (ڕێ)یانەی دروستیان دەکەی هــەموویان لـە بەرزیدان ، لەسەر کێوانن ، بەناو جەنگەڵان تێدەپەڕن •

وتم : قوزبان ، لەئەرزێ ساف‌و راستدا چ پێویست دەکات رێگا دروست بکرێ ؟ لەسەررووی خاکی سافدا گوزەر کردن ئاسانە ، تەنانەت بەبێ ڕێگاش مرۆڤ دەگاتە جێ ••

وتم : (ڕێ) لەو کاتەدا پێویستە ، کە لەجێگایکی سەختدابـێ ، ڕێگا لەسەرکێوو تەپۆلکەکاندا دروســت دەکـرێ ، ••• سەرۆك لێی پرسیم : ئەو ڕێگایانەی دروستیان دەکـەی بەکەڵکی کێ‌دێن ؟ کێ‌بەو (ڕێ)یانەدا دەڕوا ؟!

کەزانیم حەز دەکات نەختێ لەمەسەلەی ئـەو (رێ)یانەدا حاڵی بێ ، بۆم ڕوونکردەوە !

وتم : هەر رێگایەك پیاوی خۆی هەیە ، هەندێ بە دوای عیشقدا دەکەون ، هەندێکی تر بۆ خەزنەیێ ، کیلێ تیێاندا وێـڵ دەبن ، بەڵام لە هەمـووان زیاتـــر تەقاویتەکان سوودی لێدەبینن ، هێشتا هەر تاریكو روونە کەدەرژێنە ئـــەو رێگەو بانانەوە هەیە بـۆ دەردەســەرێ •• هەیشـە بـــۆ زاخاودانی مێشك ، وتم نەخۆشی مێشك ئێستاکە زۆربووە ••• بۆم روونکردەوە : چەشنەها ئادەمیزاد لەورێیانـە دەبینـدرێن کـە هەندێـکیان بێدەنـگنو هەندێکیشـــیان پێدەکەنن •• هەندێکیان سەرپێك وەدەنێن ، ئەو رۆژەیەکێ گلەیی دەکرد کەرێگام نەگایاندۆتە سەر قەڵا ، سەبـارەت بەوە شەلوارەکەی تیزماڵ تیزماڵ بووە •• لێم پرسی : چ پێویستە بگەیتە سەر قەڵا ؟ ئارامت بێ تاکو (رێ) تەواو دەبێ ئەوکاتە •••

وتی : براکەم ( ئەمن گەردی بەیانیم ) ، توانای ئارام گرتنم نیە •• دەمەوێ تا زووە لە بڵندیەوە سەیری خوارەوە بکەم ، ئەگەر کەوتیشم ، ئیتر بڵندیم ناوێت •• ئەو وەختە بەڵێنم پێدا کەرێگا تاسەر قەڵا ببەم ، ئێستاکە خەریکی ئەو رێیەم •

ئەو رۆژە ( خارچف ) ، ئەڵبەتە ( خارچف ) دەناسی ؟ ئەو

بەهۆی ( باڵە ستۆی خوێن )ەوە هەمیشە پیاسـە دەکات ، بەلاّم چونکە قەڵەوەو ناتوانێ لە رێگادا بڕوات دیاربوو هەر دادەدادی بوو دەیگوت : ئەو رێگایانە چین کە تۆ دروستیان دەکەی ؟ ئەو رێیانە هی ئادەمیزاد نین بۆ هەڵۆیان چاکە ! وتی ئەگەر نەختێکی تر راستو سافتریان دروست نەکەی وای لە حاڵت !! چی لە توانادایە بیکا ؟! ئەو ناتوانێ خۆ لەهەموو رێگایێ بدا •• بەهەر حاڵ چووم رێگایەکی راستو سافم بۆ دروستکرد ••

ئێستا ( دوکتۆر شمۆکف )یش سوودی لێدەبینێ •••

رێگایەکی راستەو ، دەگاتە سەرکانیەك ، لەوێدا حەوزێکیشم دروست کردووە کەئاوی لێ بخۆنەوەو لەکاتی ماندوویەتیشدا لێی بحەسێنەوە ••

مامیلەکانی من ئادەمیزادی سەیرن •• بەلاّم گەشتوەرەکان هەق پەرستن ، ئەو رۆژە تریانێك تەماتەیان بۆهێنام ، یەکێك لەوانە کە خەڵکی ( سۆفیا ) بوو پێی وتم : داوایێکت لێدەکەم ، ( تۆ خزمەتی گەشتوەران دەکەی ) •• وابزانم ئەندامی حزب بوو ، بۆیە پێی وتم : تۆش خۆیی ، تەنها ئەوەندە هەیە کەتۆ لەئێمە بەگوڕو بەجۆشتری •• مرۆی سەرگەرم بوون •• قسەیان دەکرد •• پێدەکەنین ، ساعاتێکی تەواو لە دەورم دەگەڕان تەنها یەکێکیان نەبێ کە حەزی لەلاف لێدانو سنگ دەرپەڕاندن بوو بۆیە کە چاوی بە گەسکەکەی دەستم کەوت لێیپرسیم ! تۆ چ سوودێك لەم گەسکەدەبینی ؟

وتم : دڕکو داڵی سەرڕێی پێ‌ڕادەماڵم •

لێی‌پرسیم : جا بۆچی رایاندەماڵی ؟

وتم : تا ئەو کەسەی کە بەپێی پەتی لەو ڕێیانەدا دێ‌ودەچێ ئازار نەبینێ •

لێی‌پرسیم : بۆچی ئێستا پێخواس ماوە ؟ تۆ لە ( بولگارستان )دا کەست بەپێی پەتێ دیوە ؟ دەتەوێ چی بڵێی ؟ دە تەوێ بڵێ کە لە بولگارستاندا خەڵکی پێخواسن ؟! زووبـە خـۆت ئاشکرا کە !! کوا پێناسەکەت ؟

وتم : فەرموو ، ئەوە پێناسەکەم ، من ( ڤلاشۆ )م •• ئەوەتـــا ڕێنووس دەقی ئەسڵەکەیەتی ••

وتی : ئابزانم پێکەنـە ددانـەکانت ببیـنم •• لەوێنـەداوا دیارە ددانەکانت دەسکرد نین •• پێکەنیم ددانەکانم پێشاندان •• ئا ئەوەتا •• سەیری !

ـــ : ددانەکانت بۆچی دەسکردن ؟

ـــ : کەوتوون •• پیر بووم ئیتر ••

هەڵگێڕو وەرگـێڕی بەپێناسـەکەم دەکـرد : بـەڵام لەم وێنەیەدا ددانەکانت دەسکردنین ؟!

وتم : ڕاستە پێناسەکەم هی ساڵی پەنجاو سێیە ••

ددانەکانم وێڵ‌کـردن بـەو ڕێـگەو بانانـەوە نووسان کـە دروستیان دەکەم •

لێی پرسیم : کێ پارەت لەباتی دروستکردنی ئەو ڕێیانە دەداتێ ؟
وتم : هیچ کەس !
ــ : ئەی بەبێ پارە •• ها ؟!

یەخەی گرتم : یاڵلا ، پێشم کەوە ! یاڵلا ! دەی بابچین (راوێژکار)و کارمەندانی شار ببینم ، بزانم ئەتۆ چ کارەی‌و لەپێناوی چیدا ئەو چاکیە دەکەی ؟
بەسەرۆکم وت : لەسەر چیادا ، ژیانم ئاوا دەگوزەرێ •• چ دەکرێ ، چار چیە ؟ ئەم دونیایە هەموو چەشنە بنیادەمێکی تێدایە ••

سەرۆك وتی : بلێ بزانم ، بلێ ! تەواوی کە ، قسەت خۆشن تا تۆ قسەکانت تەواو دەکەی ، منیش تەلەفۆنێك بۆ (ژمێریار) دەکەم دەستە جلێکت بۆ ئیش بداتێ •
وتم : جەنابی سەرۆك (ژمێریار) رازی نابێت •
ــ : بۆچێ ؟ مەگەر تۆ ( ژمێریاری ئێمە لەکوێ دەناسی ؟ • )
وتم : (ژمێریار)ی ئێوە ناناسم ، بەڵام مامەڵەم لەگەل (ژمێریار)ی دارستان بووە •

بۆ سەرۆکم روونکردەوە کە چۆن رۆژێ جەنگەڵبانێك هاتە لام‌و تکای لێکردم کە بچمە یاری ، هاوین‌بوو ، (لەوکاتەیدا کە کرێکار وەدەست ناکەون) ، داوای لێکردم چ بەهیمەت چ بەقیمەت یارمەتی بدەم • وتی : لافاو هەستاوەو بەشێکی جادەی بردووە ،

ئەمڕۆ سبەی شتێك ړوودەدا ، ئۆتۆمبیلێ وەردەگەڕێ ، کەسێ
سەری دەچێتە قوڕ ئەو کاتەی من خاکی کوێ بکەم بەسەرما •
چووم ئیشم بۆکرد ، ڕۆژی دوایی هاتەوە وتی :
مام ڤلاشۆ ، باوکم بڕۆ سۆراخی ئیشی خۆت ، ئێمە کرێگارمان ناوێ !
وتم : بۆچی ؟
وتی : باشە پێت دەڵێم ، ژمێریار دەڵێت : ئەو کابرایە شێتە ، ئێمە ناتوانین ئیش بەشێت بکەین لەوانەیە کەتێنێکی لەدەست بقەومێ ، ئەو کاتە شانەکە لەسەری کێ دەشکێ ؟!••

باوکم لەوانەیە بپرسن ، چۆن کار بەپیاوی ( نائاسایی ) دەکەن!
(ژمێریار) وتی : زووکە بڕۆ وەدەرینێ •• ئێمە پێویستیمان بە شێتان نییە ••

جەنگەڵبان وەدری نامو وتی : ئەگەر دەتەوێ کاربکەی دەبێ پسوولەی پەسندنامەی دکتۆرت هەبێ •

سەرۆك وتی : ئاخری تێنەگەیشتم ، تۆ بۆچی بێ پارە کار دەکەی ؟ لەکاتێکدا پێویستە کرێی خۆت وەرگرێ ••

بۆم ڕوونکردەوە : کە هەر لەسەر ئەو مەسەلەیە دووچاری چەندین بەڵاو سەریەشەبووم •• چەند جار لەگەڵ کرێکارانی ئەو بڵندیانە دەمەقاڵیم بووە •• چەندجار لەناوەراستی ڕێیدا تێك هەڵنگوتووین •

رۆژێ یەکێ لەو کرێکارانە لێم هاتە پێش و وتی : ئەتۆ بۆچی بەبێ پارە کاردەکەی ؟ پێم نالێی بۆچی لەقیمەتی ئێمە کەم دەکەیەوە ؟ ئێمە هەموو بە پارە کارەکەین کەچی جەنابیشتان بەخۆڕایی !!•

یەکێکی تر کە لە هەمووان (داخ لە دڵ تر) بوو ، دادەدادی بوو ••

دیگوت : ئەو گەردن شکاوەی دەزیێ باقین •• بەمەرگی ئەحمەقێك دونیا خراب نابێت ، ئەگەر نەختێ هێزم نەدابوایە بەرخۆم دەرووباریان هاویشتبووم •

دەیانگوت : ( تەیری گول قابیل بەداری زەقنەبووتە) •• دەبەنگ خۆت بگرە •• راوەستە چیت بەسەر دێنین ••

وتم : هەر کارێکی دەتانەوێ ، بیکەن ! ، قسوور مەکەن •• من حەزم لەم کارەیە •• حەزم لێیە رێگەوبانان بۆ خەڵکی بکێشم ••

بەسەرۆکم وت : کەیەکێ تەماشای بەرزی دەکا دەیبینێ پڕی دڕك و داڵ و کوچکە بەردە •• رێگایەکیان بەناودا دەکێشێ • • (بەرەووبلندی) دەیبا ، دەیبا •• رێ خوار دەبێتەوە •

راست دەبێتەوەو دەیگەیێنێتە لوتکەی کێو •• تەماشادەکات بنیادەمی پیدا دەڕۆن •

گوێ قوڵاخ دەکات : (کوڕو کچ) دەردی دڵی یەکتری تێدا دەڕێژنو ژوانی تێدا دەکەن •

ئەویش دڵی لە خۆشیانا دەکرێتەوە •• گەش دەبێتەوە ••

بەسەرۆکم وت : بەڵام کە بە پارەبێ ، بەو جۆرەنیە ، مرۆڤ خۆشی لێ نابینێ •

ئەو رۆژە دیتم کوڕێـکو کچێك بـەرەو ژوور هەڵدەکشێن منیان بینی خەریکم ئەو کەڵە درەختانەی قەراخی جادە دەبـڕم لـێم هاتنـە پێـشو وتیـــان هـاوڕی سـەرکەڵان بـبرە بـەڵام توخـوا وورپابـە بەجـارێ رێـگا رووت نەکەیتـەوە • وتیـــان : هەندێ لەو تەقاویتانە حەزدەکەن بەڵامان بۆ بێنەوە •• دەیانەوێ بڵێن کە پیرەمێردەکان حەزیان لە سەرە تاتکێو دیقدیقانێیە جێگایەکـیان با بۆ بمێنێ کە خۆیانی تێدا وەشارن ••

بەسەرۆکم وت : ئیـتر هـەر کەسێ پێشنیهـادی رێیـەك دەکات •• ئەم دونیایە هەموو چەشنە بنیادەمێکی تێدایە •

ئەو رێگایانە دارکەرەکانیش سوودی لێ دەبینن •• هـــەر بەو هۆیەشەوە بوو منیان لەبەر دەستی کرێکارەکاندا دەرهێنا ••

بەسەرۆکم وت : لەبەردەستی ئەوانەی کە لەبریتی رێـــگا دروستکردن دەوڵەت پارەیان دەداتێ •• بەڵام دارکەرەکان مرۆی سادەو دڵپاکن ، زۆربەیان ووشـکەدارم بۆ دەهێـنن •• یـارمەتیم دەدەن •• نازم هەڵدەگرن ••

پێم دەڵێن : ئێمە پێویستیمان بە تۆیە ، نابێ بڕۆیو بەجێمان بێـڵی ••

ئادەمیزادی سەر زیندوون •• سادەو دڵپاکن ، خۆشەویستیان لێ دەبارێ •• ئەگەر ئەوان نەبونایە ، لەوانە بوو ئێستا لە دونیادا نەدەبووم ، سەبارەت بەوەی کە ژنەکەم لەمال نیـــە لە چێشـــتخانەدا کاردەکات ، حەفتا (لیڤ) وەردەگرێ ، هــەر لەوێش نان دەخوا •• کوڕەکانیشم تەنانەت سەریان لەم قسەو باسەنە دەرناچێ ، چ جــای شتیتر • ئەگەر خانوو و پارەیان هەبێ ، بەرپێی خۆیان نابینن ، بۆمنیش هەر هیچ •

بەسەرۆکم وت : لەم دونیایەدا هەر کەسێ رێیەکی هەیە ، هەرکەسێ ئامانجێکی هەیە •

سەرۆك وتی : بلێ •• قسەبکە ، قسەت خۆشن •• چێژیان لــێ وەردەگرم •

لێی پرسیم : چەند جۆرە رێگاهەیە ؟ کەچ ، راست ، چاك ، خراپ •• ( حەزی لێبوو بیزانێ ) •

وتم : جەنابی سەرۆك ، ناگوترێ ! بەتەواوی ناگوترێ •• ( رێگای خەراب نیە ) !! رێگایێ ئەگەر هەبێت حەتمەن بە جێگایەك هەر دەگات •• بەلام فلانە رێ ، دەگاتە کوێ ، ئەمەیان قسەیەکی ترە • بۆ نموونە رێگایەك درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە لووتکەی چیا •• باشە ، ئەو بلندیە بۆ خۆیت رادەکێشێ ، تۆش دەڕۆی ، دەڕۆی

تادەیگەیتێ ، دوای ئەوە پێت دەڵێت : دەئێستا سەیرکە ، تەماشای دەشتی کاکی بەکاکی بکە ، تەواوی شار لەژێر پێی تۆ دایـە ، ( لێگەڕێ ئەگەر بۆ جارێکیش بێت لە بەرزییەوە سەیری دەشت بکرێت ) •

ڕێگایێکی دیکە هەیە ، دەڕوات تا دەگاتە نوختەیـەك دەڵـێن پێویستە ئەو نوختەیە ئاوێـکی لێ بخورێتـەوە ، پشوویێـکی تیـا بدرێ •• ماندوویێکی تێدا بحەسێتەوە ••

ئەو پەلەییەت لەچی ؟ خێرا پـەی بـکەی‌و لەسەرخۆ بڕۆی بەجێگایێ هەر دەگەی ••

( ئاخر براله ئەمن گەردی دەمەو بەیانم ، توانای ئارام گرتنم نیە تاکو زووە دەمهەوێ لە بڵندیەوە سەیری خوارەوە بکەم •• ) ئیتر وایە ••، ئەگەر ڕێگەوبان نەبن مرۆڤ چوزانێ چی لـــە هەندەراندا هەیە • دار (زەیزەفۆنێك) هەیە منێ ڕێگایێکم بۆکێشا ، هەر بەناوی ئەویشەوە ناوم نا ( زەیزەفون ) ، ئـەو نـاوەی پێوە مایـەوە ••

ئەو ڕۆژە بینیم یەکێ بەو ڕێیەدا دەگەڕێتەوە ، لێم پرسی : هاوڕێ ، لەکوێ دێیتەوە ؟

وتی : لە ڕێگای (زەیزەفـون)دا پیاسەم دەکرد ، تا (زەیزەفـون) وەسەرکەوتم ••

هەندێ جار هەر بەتایبەتی لە خەڵکی دەپرسم ، فلان بـــۆ کوێ چووە ؟! چی بکەم بە خۆم نیە دڵخۆش دەبم •• ئیتر هـەر کەسێ رێیەکی هەیە ، هەر کەسێ ئامانجێکی هەیـە • سـەرۆك گوێی قوڵاخ کردبوو ، سەیری ددانەکانی دەکردم •• دەیگوت: بڵێ •• قسە بکە ، قسەت خۆشن •

پێم وتم : جاقوربان لەمەش چاکـتر رێـگاوبانە کۆنەکانن • سەردەمێ رێگا بوو •• ئێستاکە کوێر بووەتەوە ، بەڵام شوێنەواری هـەر مـاوە ، کـە بەرێگایـەك لـەو رێیانـەدا گـوزەر دەکـەی (بەسەرسامیەوە) لە خۆت دەپرسی : گەلۆ ! تۆی بڵێی ئەم رێیە بۆ کوێ بچێت ؟

دەبینی لە وەختێکدا شکارتە دەغـلبووە ، ئێستاش بەیـارەو کوێر بووەتەوە ، بەباران شۆردراوەتەوەو دیوارەکانی رۆچووە •• بەڵام دیسان شوێنەواری هەرماوە کە رۆژێ لەرۆژان شکارتە بووەو کرداری تێداکراوە • ئەگەر بەچاکیش لێی ووردبێتەوە جێگای جۆخینو خەرمانیش دەسنیشان دەکەی ••

ئەو رێیانەش ، بەرێگای تر دەگەن ، ئەوانیش رێی تریان لێدەبێتەوە ، لەو رێیانیـشدا کەسـەیر دەکەی چـاوت بەچاڵو کەندەکان دەکەوێ کەبەدوای شتێ، خەزنەیێ سکیان هەڵدڕاوە••!!

شوێنەواری وێڵێو کونجوکاوی کرێکارانی لە رۆخەکاندا دەبینرێ ، جا ئەوانە چیان دەست کەوتووە یان نەکەوتووە ئەمەیان

نازانین •• ڕێگای سێیەم تەماشا دەکەی پێچاوپێچو بەگەوەیــە ، بەرەو ژوور درێژدەبێتەوە ، سەرەو خواریش دەبێتەوە •• دەڕوات تادەگاتە تەك دیواری کۆنە قەڵایێ ••

سەرۆك وتی : باشە ئێستا دەتەوێ چ بڵێی ؟ تۆ ئـــەو ڕێگایانە چاك دەکەیتەوە ؟

وتم : گرینگ ئەوەیە ، ئەو ڕێیانە بەکوێ دەگەن •• هەنـدێ ڕێگاهەن بەقسەی خەڵکی مردوونو کوێر بوونەتەوەو بەهیچ جێگایەك ناگەن •

گریمان ڕێگایێ دەگاتە سەر بێستانێکی بەردراو ، بێستانێـکی بێ ئاو چ ســوودێـکی دەبێ • قەڵایێـکی ئازادکـراو بــەکاری چیدێ ••

چ پێویستە ڕێگایەك دروست بکرێ کە لە وێرانەیەکدا تەواو دەبێ ؟

ئەگەر هێشتا شتێکی تێدا مابێتەوە ، چاوگەیەکـی لێبێت •• درەختێکی لێ بڕوێ ، سایەو سیبەرێکی هەبێت بێی بحەسێتەوە •• جوان و شۆخ بێ ، دڵی مرۆڤ خۆش بکا •• ئەوکاتە جێی خۆیەتی چاك بکرێتەوە ، لەنۆژەنەوە بکێشرێتەوە •• بەڵام ئەگەر ئەو ڕێیە بەهیچ شوێنێ نەگا ، بۆچی چاك بکرێتەوە ؟•• یاخود بۆچـــــی دروست بکرێ ؟

سەرۆك وتی : ئەگەر سەهو نەبم ، وا دەزانم گرینگترین شت لەلای تۆ ، جوانی‌یە •

وتم : وەکو دەفەرمووی وایە • جا ئەگەر جوانی نەبێت ئەم دونیایە بەچێ دەچێ ؟

وتی : کەوایە تۆ ئەوەندە ئاشقی جوانی : بوەستە دەستە جلێکی جوانت بدەمێ • ئەو کاتە دەبینی کە ئێمە بەتەواوی لە یەکتری دەگەین •

تەلەفۆنەکەی هەڵگرتو (ژمێریار)ی دەنگ دا : ئەلۆ ، (دیمۆف) تۆزێ وەرە ئێرە ، دەمەوێ شتێکت نیشان بدەم (ژمێریار هات ) •

سەرۆك وتی : دیمۆف ، دەمەوێ ، دەستە جلێك بدەینە باوەمان ، ئەمە (ڤلاشۆ)ی بەناوبانگە ، کە لە شاری ئێمەدابە خۆڕایی رێگاو بانان دروست دەکا • دەڵێم بەڵکو دەستەجلێکی بەرکەوڵی بۆ پەیدا بکەیت ، ئێستا پاییزە ، دونیا یەك پارچە شێدارە پێویستە خۆی گەرم داپۆشێت ، پێویستە ئاگاداری خۆی بێ •• ( ژمێریار پەسندی کرد •• ) •

— : حەتمەن پارەی جلەکان دەدات ؟

منیش وتم : جەنابی سەرۆك ، بۆ ئەو ووردە ئیشانە ئەزیەت مەکێشن ••

سەرۆك وتی : وورده ئیشی چۆن ؟ مەگەر تۆ لەلای ئێمە چوكەی ؟
ناوبانگی تۆ لە تەواوی شاردا بڵاوبووەتەوە • چۆن دەبێ
بەبێ بەرگ بهێڵرێتەوە ؟ كێ ناڵێ بەیانی سەرمات نابێت‌و
لەنێو ناچی ؟
لە دڵی خۆمدا وتم : عەجەب بنیادەمـی چاك لـەم دونیایەدا
هەیـە !
دیاربوو سەرۆكیش هەمان قسەی دەكرد •

ــ : هەوڵ دەدەین هەقی تەقاویتیت بۆ دەسگیربـكەین ، تـۆ
كاربۆ دەوڵەت دەكەی ، بۆ ئەوەی گەر رۆژێ خوانە ـ
خواستە شتێكت بەسەرهات : دەستێكت شكا •• پایەكـت
بریندار بوو ، شتێكت هەبێت ژیانت دابین‌بكا •
( ئەوان گاڵتەو گەپیان دەكردو منیش پێدەكەنیم ) •

وتم : باشە ئەدی ئەگەر هیچ شتێ رووی نەدا ؟!
( سەرۆك سەری سوڕما ! ) •
ــ : چۆن ؟! خۆت شتێ دەكەی ؟ مەگەر نابێ ؟!

وتم : بۆچی نا قوربان ، هەموو شتێك دەبێـت ، هەمـوو شـتێك
لەدەستی ئادەمیزاد خۆی دایە •• بۆچی نابێ ••؟

شت نیە نەبێت قوربان • كە ئەمەم وت‌و ، توزێ گرژیمەوە ،
دەمی بوو بە تەڵەی تەقیـوو ، راپـەری یـەك بـەخۆی قیژاندی
بەسەرما !

ـــ : کەوایە ، فێڵبازی خوێـڕی ، ئامـادەی کەتنێـك بـکەیو
موو چەی (تەقاویتی) لە دەوڵەت بستێنی ؟ دەتەوێ کڵاو بکەیتە
سەری دەوڵەت !!

بەڕێوەبەری وت : سەیری کە ، سەیری کە تەنها پێـــستی
سەرەوەی هی بینادەمە ! ئەو ئادەمیزادە پیرۆزو موبارەکە دەبینی
کە لەرێی خوادا رێیان دروست دەکا ، کەچی دەیەوێ کڵاو
بکانە سەری دەوڵەت !

دادە دادی بوو •• دەیقیژاند !

ـــ : دەمەوێ بۆم روون بکەیتەوە ، دەمەوێ بزانم بۆچی کاری
دروست کردنی رێگاوبانان بەشێتو شوران دەسپێررێ ؟
بەرپرسیارانی ئێمە بۆچی خەوتوون ؟!
( دەستی بەرزکردەوەو رێگای پێشاندام ) •
ـــ : بۆ دەرێ ! زووکە دەی بڕۆ دەرەوە نامەوێ چیتر بتبینم !
بشزانم پێت ناوە بەچیـاو جەنـگەڵان وای لـە حـاڵت ••
فێڵبازی ، بەدفەساڵ •• زووکە بڕۆ دەرەوە •

منیش هاتمە دەرێ •• چ دەتوانم بکەم •• بەسەرۆکم وت :
هەرکەسێ رێگایەکی هەیە پێدا دەڕوا •• ئێستا کە لێم ناگەڕێن
چیدی رێیان دروستبکەم ، خودا دەیزانێ زۆر رەنج دەکێشم ،
چونکە ئەوان نازانن کە هیشتا دەبێ چەندین رێگا دروست بکرێن
چەندی دیکەش زیادنو پێویستە ببەسترێن •

## ئەم شانۆییـــە

وەختی خۆی سالی ١٩٧٦ گۆڤاری ( الاقــلام ) ی ســەر بــە وزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن لە یەکـێك لــە ژمارەکانی ئــەم شانۆیی یەی • بلاو کردبووەوە ، منیش هەر هەمان ســاڵ کردم بــە کوردی و بلاوم کردەوە •

ئەمساڵ کە ویستم ئەم چەند چیرۆکە لە دوو توێی کتێبۆلەیەکدا چاپ بکەم ، وام بە باش زانی کە ئەم شانۆییەشیان بەگەڵ بخەم ، وتم مادەم هەر هی هەمان نووسەرە ، بێ ســوود نابێ ئەگەر بیکــەم بــە پاشکۆی چیرۆکەکان •

بەم جۆرە جارێکی تری پێداچوومەوە و بەراوردم کردەوەو نووسیمەوە • شایانی باســە کە ئەم شانۆیی یــە لە بەغــدا بە زمانی عارەبی یاری کراوە ••

- وەرگێر -

# قانخێک لەدارستاندا

چیرۆک بۆ شانۆ

[ کەسەکان :

**مارین :**

پاسەوانی دارستان •

**گینا :**

ئافرەتێکی تووتنەوان •

**- ١ -**

**مارین :**

ئێه ! کەواتە تۆ ژنی ؟ !

**گینا :**

ئەی تۆ ، توخوا تۆیش پیاوی ؟

**مارین :**

راستیی تۆ وەکو پیاونامبینی ؟

**گینا :**

ئەی تۆ تۆ تێبینی ئەوەت نەکرد بوو من ژنم ؟
دوای ئەوەش ئەو لوولەیە لادەو بەسم دەزگی رابکە ! لە هەر حاڵەتێکدا بێ دەزانم کە نایتەقێی •

**مارین :**

وای تێ دەگەی ؟

**گینــا :**

دەی ، دەی ، دەپیشانم •• دەی بزانم بیتەقێنە !

**مارین :**

بوەستە ! دەڵێم بوەستە ، لەگەڵ تۆمە قسەی بنیادەم تێ ناگەی ؟

**گینــا :**

جا تۆ لەو باوەڕە دای ئەم قسانە قسەی بنیادەم بێ ( ب •• وە •• س •• تە ، مەبز •• و) جارێ ئەوەڵەن خێرا ئەو تفەنگەم لێ دوورخەرەوە دوای ئەوەش پێم ناڵێی چیت لەمن دەوێ ؟

**مارین :**

بۆچی ئەو لکەدارانە دەبڕی ؟

**گینــا :**

پێم دەوێن ، تووتنی تێدا دەپارێزم •

**مارین :**

بۆ کۆمەڵەی هەرەوەزی ناتاندانێ ؟

**گینــا :**

نــەء •

**مارین :**

بۆچی ؟

**گینــا :**

لە خۆیان بپرسە !

**مارین :**

جا بۆ ؟ لەسەر منە لێیان بپرسم ؟

**گینــا :**

ئەی چ سوودێکی هەیە ، ئەگەر من لێیان بپرسم ؟ دەزانـــم

یەکسەر پێم دەڵێن نی‌یە بەرهەمی تووتنی ئەمساڵ فرەیەو لکەدار بەش ناکا .

**مارین :**

باشا قەنیاکە ، بەڵام تۆ پێم بڵێ ، دەزانی گەر هەموو تووتنەوانەکان وەك تۆ هاتن‌و لکەداری ئەو دارستانەیان نەهێشت چ دەبێ ؟

**گینا :**

چ دەبێ ؟ لکەدارەکان دەبەن‌و تووتنی پێ دەپارێزن‌و هیچتر !

**مارین :**

گوێ‌بگرە ! لەسەرت دەنووسم‌و موحاکەمەت دەکەین .

**گینا :**

دەی لەسەرم بنووسەو موحاکەمەم بکە !

**مارین :**

ناوت ؟

**گینا :**

گینا .

**مارین :**

باوکت ــ یا ــ مێردەکەت ؟

**گینا :**

کەسم نی‌یە .. خۆم‌و تەواو !

**مارین :**

یاڵلا لەگەڵم بۆ پولیس‌خانە ! یەڵلا ! لەوێ لە پێناسەکەت دەکۆڵینەوە .

گینـا :

ئەدی ئەگەر لەگەڵت نەیەم ؟

مارین :

بە زۆر دەتبەم !

گینـا :

بەچی دەمیەی ؟ بە پەیتوون ، یا بە عەرەبانەی دەست ؟٠

مارین :

چۆنی تۆ دەیڵێی ٠

گینـا :

ئەوەی من دەیڵێم بەدەست هەڵمگری ، دەی بمبە ، هەڵمگرە !
خودایە تووشی‌چی بووین پیاویش وایان لێ‌هاتووە ژنان بترسێنن٠!!
دەی با بڕۆین ، چۆنی دەڵێی ، بەڵام لکەدارەکان دێنم چونکە
بێ ئەم لکەدارانە تووتنەکەم دەرزێ ٠٠

مارین :

بیان هێنە ٠ بەڵام ئەدی ئەوانە چین ؟

گینـا :

بۆچی نابینی ئەوانە چین ؟ چین ، پەلکەدارن ٠

مارین :

جا ئەم پەلکە دارانەت بۆ چی‌یە ؟

گینـا :

کەشتیەوانێکم لەماڵەوەیە ، قایخێکی بۆ لی دروست دەکەم ٠

مارین :

کوڕەکەت ؟

گینـا :

ئـــا ٠

**مارين :**

مسۆگەر باوكيشى كەشيتەوانە •

**گينـا :**

كەشتيەوان بوو •• رۆيى ، كۆچى كرد ، وەرە دەى ياريدەم بدە ئەو تفەنگەشم لێ دوورخەرەوە ، سـوودى نىيـە لەگـەڵ ئێوەى پياو ، هەميشە گرژن •• بەرگى رەسمىو چەكو مەى بە هەموو هێزێكى پياوەتيتانى دەزانن !

**مارين :**

ئەم چەكە ئامرازى منە •

**گينـا :**

جا توخوا ئەوەش ئامرازە ، پێم ناڵێى چەند گيانت بەم ئامرازە نابووت كردووە ، پێم ناڵێى ؟

**مارين :**

چاتر وابوو بپرسى چەند كەست پێ ترسانـدووە ، نــــەك چەندت پێ كووشتوە ، چونكە ئێمە بۆ پاسەوانى لێرەين نـەك بۆ كووشتن •

**گينـا :**

تەماشا چەند دەترسى !

**مارين :**

نەمزانى كاممان دەترسين ؟

**گينـا :**

دەتەوێ بڵێى كە من دەترسم ها ؟ وام دەبينى ؟ چۆن چۆنى ديارە ها ؟ بوەستە ئايا من دەترسم ، قسە بكە دەى بڵێ كاممان ؟

**مارین :**

دە ئەو دارانە هەڵگرەو بڕۆ !

**گینــا :**

نەخێر هەڵیاناگرم و ناشڕۆم، دەبێ پێم بڵێی کامان ترسنۆکین، ئا ئەوەم دەوێ پێم بڵێی •

**مارین :**

بە تەبیعەتی حاڵ تۆ ! سەیری ڕەنگ و ڕوخساری خۆتـــت کردووە چۆن دابچکوڕاوە ؟

**گینــا :**

ئاخری بە ترسنۆکیشم دەزانی ؟ ئای •• هەی ! ئەگەر کەسێ هەبووایە لکەدارم بۆ ببڕێ ، ئەوەندە ڕەنگ زەردو بێتووك نەدەبووم تۆش وام پێ بڵێی

**مارین :**

ڕاوەستە ! چیتە ؟ جارێ دەگری و جارێ تووڕە دەبی ، ئایـا دەزانی شان لەشاندانی پیـاوی حـکومەت ، ئەگـەر لـەسەرت بنووسێ ، زیندانی بەدواوەیە •

**گینــا :**

ئەدی بۆ وەستاوی ، دەی لەسەرم بنووسە ، دەزیندانێم باوێ، بەڵام ئەوەشت لەبیر نەچێ کە من دایکی منداڵێکم و کاتێ دەچمە بەندیخانە تۆ بەرپرسیاری ژیانی دەبی •

**مارین :**

نەخێر مێردەکەت پەروەردەی دەکا •

**گینــا :**

مێردم نییە •

**مارين :**

چی ؟ بۆچی تۆ بێوەژنی ؟

**گینـا :**

نــەء !

**مارين :**

کەواتە تەڵاق دراوی •

**گینـا :**

نەخێر تەڵاقدراویش نیم ، چونکە هەر شووم نەکردووە !

**مارين :**

چ چۆۆن ؟ چۆن دەبێ منداڵێکت هەبێو شووت نەکردبێ ؟
پێم بڵێ بەراستنە شووت نەکردووە ؟

**گینـا :**

ئەم پرسیارەت بۆ لێکۆڵینەوەو مەحکەمەیە ، یانەخۆ بۆ ؟

**مارين :**

ئا •• بۆ لێکۆڵینەوەیە •

**گینـا :**

تۆ لەکەیەوە لەم ناوچەیەی ؟

**مارين :**

مانگێك زیاتر نابێ •

**گینـا :**

مانگێکە لەم دارستانەدا پاسەوانی دەکەی ، تا ئێستا نازانی کێ
شووی کردووەو کێ نەی کردووە ؟

**مارين :**

ئەوە کاری من نی‌یە •

گینـا :

کە ئەمە کاری تۆ نی‌یە ، ئەدی بۆچی لـێم دەپرسی شـووت کردووە یان نا ؟ باوکی کوڕەکەت کێیە ؟ گوێ بگرە ! گەر پێت بڵێمو تۆش لە مەحزەری لێ کۆلینەوەکەت بینووسی کـە من بێ مێرد ئاوس بووم ئاکام چی لێ دەسەنگرێتەوە ؟

مارین :

مارین : جا ئەوە پەیوەندی بە منەوە چی‌یە ؟ کاری من نی‌یە .

گینـا :

کاری من نی‌یە ، کاری من نی‌یـە ، .. بـۆچ بـەو جـۆرە تێمەوەڕادەمێنی ؟ قسە بکە ، مەترسە کەس لێرە نی‌یە گوێی لێ بێ .. قسە بکە ! بەرووەروو پێم بڵێ .. بە هاوار ، بـە هەموو دەنگتەوە بڵێ ..

مارین :

چیت پێ بڵێم بەهاوار ، بە هەموو دەنگمەوە ، چی ؟

گینـا :

پێم بڵێ .. بقیژێنە .. ها تۆ قەحپەی بەدرەوشت .

مارین :

کچێ دەتۆ گوێت لێ بێ ..

گینـا :

بە ئەزرتم ئەگەر بۆ جارێکیش بێ لە ژیانم ، بەرەورووو ئـەو گۆتانەم پێ بڵێن کە لە پاشملە پێم دەڵێن !

مارین :

بەڵام تۆ .. چۆن ؟ گوێ‌گرە ، ئەوە دیسان دەگری ؟

**گینا :**

جا بۆچی نەگریم تۆ تۆ چی تێ دەگەی ؟

**مارین :**

ئەگەر کڕ نەبی ••• وای ••

**گینا :**

لە گوندی نامهێلن بگریم ، بە لای گەمەوە لێم گەڕێ با لێرە بگریم ، دایکم هەمیشە چاوەدێریم دەکا ، کە دەبینێ ئاخێك هەڵدەکێشم یا دەگریم یەکسەر بەسەرمدا دەقیژینی : ! وس بە! بێ دەنگ تاعوونت بۆ بێ ، ئاخی بۆ هەڵدەکێشی ؟ »

**مارین :**

بەراست بۆ ئەو کەشتیەوانە دەگری کە کۆچی یەکجاری لێنا ؟

**گینا :**

باشتر وایە یارمەتیم بدەی ، ئەو لکەدارنەم لەگەڵ هەڵگریو تا زووە بڕۆین •

**مارین :**

راوەستە ، با ئەو قووتە دارانەش هەڵگرمەوە ، دەڵێی قەسابخانەی بۆ ئەم درەختانە داناوە •

**گینا :**

وەکو ئەوەی تۆیش بە تاوانی (سەربڕینی) درەختانەوە حوکمم بدەی •

**مارین :**

که لکی دارێکت بڕی ، یانی درەختەکەت کووشت ، بۆچی وا دەزانی دارو درەخت گیانلەبەر نین ؟ نەخێر گیانلەبەرن . تەماشا ! لکەکان چۆن چوونەتە باڵیەکدی ، یەك بە یەکیترەوە دەدا ، هەر لکێك دەیەوێ سێبەر لەوەی دی بکا تا خۆی تیشکی رۆژی زیاتر پێ بگا ، هەر لکێك دەیەوێ خۆی بژیو هێـز لەوانی تر بیرێ ، تاکو وشك هەڵبێو بمرێ .. لێرە هیچ شتێك ئاسایی نی‌یـە ، وەختی گاڵتـە نی‌یە ، هەمـوو شـتێ لێرە لـە شەڕدایە .

**گینـا :**

کەواتە بۆیە تۆیش وەك زریانێکی بریندار لەمن بەربووی .

**مارین :**

من لێرە پاسەوانم دارستان لەوانە دەپارێزم کە پەیڕەوی یاسا ناکەن .

**گینـا :**

ئەگەر ئاوا یاسایی ، باشە پێم ناڵێی چی بکەم کە تووتنەکەم دەڕزێ ، وەڵامم بدەوە ! با شوێنەکانمان بگۆڕینەوە جا با بـۆ دەقیقەیەك بێ ، من دەبم بە تۆ تۆش دەبێ بە من .

**مارین :**

ئەگەر من لە جێی تۆ بام ، دەچوومە لای سەرۆکی کۆمەڵەی هەرەوەزی و پێم دەگوت ..

**گینـا :**

پێت دەگوت ، لکەدارم بۆ پاراستنی تووتن دەوێن ، ئەویش

وەڵامی دەدایەوە نیمانە • چیتر دوای ئەوە ؟ چ دەکەی ؟

**مارین :**

ئەوان پێویستە لکەدارت بدەنێ •

**گینـا :**

شتڵە تووتن دادەچێنی ، وەبەرهەمی دێنی کەچی سیس دەبێو دەمرێ ، تۆش ناتوانی بەڵێنەکانی سەرۆکی کۆمەڵە بکەی بــە لکەدارو تووتنی پێبپارێزی •

**مارین :**

باشە ، با وای دابنێنن تۆ پاسەوانی ئەم دارستانەیت منت دی لقە داری لێ دەبرم چیت لێ دەکردم ؟

**گینـا :**

لێت دەگەڕامو بەرەڵڵام دەکردی •

**مارین :**

ئەدی یاسا ؟ بە پێچەوانەی یاساوە بەرەڵڵام دەکەی •

**گینـا :**

حەقیقەت لە یاسا گەورەترە •

**مارین :**

« ئەمە حەقیقەتەو ئەوە حەقیقەت نی‌یە » دادوەر لە دادگایی ئەو حوکمەی دەدا ، من لێرە دانراوم خزمەت بکــەم نــەك حوکم بدەم •

**گینـا :**

دەهەستە خزمەتچی ، خزمەت بکە ! بۆ لای حاکم رامکێشە !

**مارین :**

تووڕە مەبە !

**گینا :**

تۆیش مەبە بە خزمەتچی !

**مارین :**

هەستە برۆ ، پەلکەدارەکانت لەبیرچوون •

**گینا :**

هەزار دەست نیم ، ناتوانم هەڵیانگرم •

**مارین :**

باشە ، من هەڵیاندەگرم •

**گینا :**

سوپاس •

**مارین :**

شایانی سوپاس نییە ••

**گینا :**

کەس بەلاش سوپاسی کەس ناکا ، ئەگەر تۆ هەمیشە بەم جۆرەبی ، ئەوا کچوکاڵ بتبینن تێرت پێ پێدەکەنن •

**مارین :**

من پەیوەندی لەگەڵ کچان نابەستم •

**گینا :**

بۆچی ژنت نەهێناوە ؟

**مارین :**

نـەء !

**گینا :**

راستە ئێوە هێچیان ژنتان نییە ؟ هەمووتان کە باسی ژن هێنان دەکەن خۆتان بە کوڕی ناو کوڕان دەزانن •

مارین :

قسه مه‌که‌و بۆ خۆت بڕۆ •• بوه‌سته له‌گه‌ڵ تۆمه ! گوێت لێ نی‌یه ؟ بوه‌سته نه‌ڕۆی ! ! واز بێنه با پشوویێ بده‌ین ، ئه‌مرۆ ده‌ڵێی ئاگر ده‌بارێ ، هه‌تاو خه‌ریکه سه‌ر ده‌برژێنێ ، تاکو تاو نه‌یئه‌نگاوتووین بچینه‌به‌ر ئه‌و سێبه‌ره ، چیته لاڵی ؟

گینـا :

ئه‌وا له‌سه‌ر فه‌رمانی تۆوه وس بووم •

مارین :

ئێستا مه‌سه‌له‌که گۆڕا ، تکات لێ ده‌که‌م قسه بکه !

گینـا :

نه‌ء تۆ قسه بکه •

مارین :

هانێ ئه‌وه پاڵتوکه‌م ، له‌سه‌ری دانیشه !

گینـا :

ئاوا حه‌ساوه‌ترم •

مارین :

ئای مه‌لعوون •

گینـا :

ئاخری وشه‌یێکی جوانت له‌ده‌م ده‌رچوو ، •••• بۆ، بێده‌نگ بووی ، چیتر ••• ؟ دوای مه‌لعوون بڵێ ! ته‌واوی که !

مارین :

زعیفه‌یێکی نه‌فره‌ت لێ‌کراو •

گینـا :

سوپاست ده‌که‌م ، که‌واته من ! زه‌عیفه‌یێکی نه‌فره‌ت لێ‌کراوم •

ئێستا دەزانم کە بەتەنێ نیمو پیاوێکم لەگەڵ دایە • بەڵام لەبیرم کرد ، تۆ پیاو نیت خزمەتکاری یاسای یان خزمەتچی یاسایی •

**مارین :**

من پیاو نیم ؟

**گینا :**

پیاوی حەقیقی قبوڵ ناکا ئافرەتێ باری گران هەڵگرێ ، پیاوی حەقیقی هاوار ناکا : ( بوەستە •• مەبزو ) بەڵکو پێی دەڵێ ( بە یارمەتیت ) •

**مارین :**

دوای ئەوە ؟ •• چیتر ؟

**گینا :**

هیچتر ! چونکە ئەوەی دەیڵێم ، نە پەیوەندی بە تۆوە هەیە نەتۆش دەگرێتەوە •

**مارین :**

پەیوەندی بەمنەوە نی‌یە ؟ جا تۆ بینیت کە ئەوە پەیوەندی نی‌یە ؟ دیتت ؟ !

**گینا :**

نەء نەمدی ، بیستم •

**مارین :**

بیـ•• سـ ••• ت ••• ت؟

**گینا :**

بەو گوێیانە •

مارين :

بیستن و بینین وەك یەك نین • ئـەوەی گوێت لێ دەبێ ئـەوە نی‌یە دەیبینی •

گینـا :

نەخێر جورئـەت ناکـەی ، گویچکـەت دەبڕم ، ئـەوە چ مێشوولەیەك پێ‌ی‌وەداوی ، دەبینم لەناکاو گەرم دەبی ••

مارين :

ئەمن پیاو نیم ، ئەوە پەیوەندی بەمنەوە نی‌یە ••• ئەمانە گوت یان نا ؟

گینـا :

جا ئەوا گوتم ، چی خراپم گوتووە ؟

مارين :

جا تۆ دەزانی شتی خراپ چی‌یە ؟

گینـا :

داخۆ هەموو پاسەوانەکانی دارستان وەکو تۆن ، بـە خـەڵکی وەدەدەن ؟ یان مێروولەیکت کەوتۆتە ناو بەرگە رەسمیەکانەوە لەبەریەوم بە ئازاری ؟

مارين :

هیچ شتێ ئازارم نادا زۆر بڵێی تۆ نەبێ ، ئەوا هەڵدەگرێ ، خوا دەزانێ چ هەڵدەگرێ ••

گینـا :

ئەوە تۆ باسی چی دەکەی ؟ •• پێم ناڵێی باسی چی دەکەی ؟

مارين :

تۆ وتت من پیاو نیم •

**گینا :**

نەخێر وانی‌یە ، من شتێك دەڵێم ، بەڵام دیارە تۆ شتێکی دیکە دەبیەی ، بە پێچەوانەی ئەوەی من دەیڵێم ، جا من لە کوێوە بزانم تۆ چ جۆرە پیاوێکی ؟ من هەر ئەوەندەم گوت کە دەبێ پیاو بایەخ بە ئافرەت بدا هیچی دیم مەبەست نەبوو •

**مارین :**

بەڵام تۆ گوتت ( بیستم ) •

**گینا :**

بیستم کە چۆنت هاوار دەکرد « بوەستە •• مەبزو ! ) پیاو دەتوانای دا نی‌یە گوێ لەم قسانە بگرێ چ جای ژن •

**مارین :**

راستە ئەوەی دەیڵێی حەقیقەتە :

**گینا :**

چاوت لێیە کە تا دوایت ئاو لەدوو بێڵێ نایێو کار بە کوێدا دەشکێتەوە ؟

**مارین :**

بەڵام گەر پیاو نەبوومایە ، نەمدەتوانی ژن بێنم •

**گینا :**

ئای •• هەی ، بەڵام تۆ گوتت ژنم نەهێناوە ؟

**مارین :**

نەم گوتووە ژنم نەهێناوە ، نەشم گوتووە هێناومە ، چونکە ژنەکەم تەڵاق داوە •

**گینا :**

جا ئەگەر تەڵاقت دەدا ، بۆچی دەتهێنا ؟

**مارین :**

راست دەکەی چ پێویستی بە ژن هێنان نەدەکرد !

**گینـا :**

ئەدی باشە بۆچی ژنت هێنا ؟

**مارین :**

ژنم لەبەر خاتری دایکم هێنا • حەزی لە بووکێکی سافیلۆکە بوو ، بەڵام بووك بە دڵی من نەبوو ئیتر ئەوەی‌بوو ، کە بوو •

**گینـا :**

چی بوو ؟

**مارین :**

ئەوەی کەبوو ئەوەبوو ، ژن هێنانێکی بێ خۆشەویستی بوو ، عەقل ناتوانێ فەرمان بە دڵ بدات ، لەبەر ئەوە بووك نـەبووە ژنی من ، لە ناوچەکەشـدا وای بلاوکـردەوە کـە من ئـەو پیاوەنیم ژنم لێ بووەشێتەوە • ئیتر تەڵاقم داو دەسـتم دایـە جانتاکەم ••

**گینـا :**

یەکسەر بۆ دارستان ، تا هێرش بۆ ژنە بێ گوناهەکان بێنی‌و پیاوەتی خۆتیانـی بـۆ دەربخـەی •• کوڕنیشمـــکان مـاوێ نێوچەوان ، سوور هەڵگـەڕێ لەشـەرمان • ئـەوەتا شـەرم دەکەی •• خودایە سەد ساڵە پیاوی وام نەدیوە شەرمێ بکا ، کوڵمی سوور هەڵگەڕێن ••• ! ئەڵڵاهـ چەنـد جوانـــە • •

**مارین :**

گینا ، لێم گەڕێ با تێتەوەڕامێنم •

گینـا :

دەستەکانتم بدێ •• بێنە بمدرێ ربا ئەوە لەباتی سوپاس بێ، مادەم تۆ شەرم دەکەی ، ئەتۆ شایانی جوانترین کیژۆڵەی •

مارین :

ئێستا وەك جاران بەینم لەگەڵ کچان نییە •

گینـا :

ئەدی بەینت لەگەڵ چییدا هەیە ؟ لەگوندی بێوەژنمان نییە، پیاوەکان دەخۆنو دەنوون و دەخۆنەوە••• ژیانی بەم شێوەیەش مردنی زۆر لێنزیك نییە •• گوندەکەمان بەهەشتی پیاوانەو بەس • هەندێ ژنی دێیەکەمان مانگی سەد تا دووسەد لیڤ وەردەگرن ، ئەی تۆ مانگانەت چەندە ؟

مارین :

سافی حەفتاونۆ لیڤ وەردەگرم •

گینـا :

بە مووچەیێکی وەکو هی تۆ دەتوانی شەتو خوارو ناشیرینکی وەك من بهێنی • ؟

مارین :

خۆزگە شەتو خوارو ناشیرینی وەك تۆ زۆر دەبوون •

گینـا :

سەرەڕای ئەوەش من دایکی مندالێکم ، بەراست پەلکە دارەکانت بۆ منالەکە هێنا ؟

مارین :

چۆن لەبیریان دەکەم ، کە سوودی مرۆڤێکی تێدایە •

**گینا :**

مرۆف ؟ بەلاّم ئەو هێشتا منداڵە •• !

**مارین :**

بەلێ مرۆف ، پیاوی دوارۆژ ، ئەی نابینی بیر لە دەریا دەکاتەوە ؟

**گینا :**

ئاخر کارەسات لەوەدایە•••! ئەوەی خەمی پێ دەخۆم ئەوەیەکە ئەم منداڵە زۆر بیر دەکاتەوە • چەند رۆژێ لەمەوبەر بیری دەکردەوە ، لێی پرسیم کێ باوکی منە ؟ ئەی باوکم لەکوێیە ؟ لە گشت منداڵەکانی بیستبوو کە بانگی باوکیان دەکەن : ( بابە •• بابە •• ) ئەویش دەیویست وەکو ئەوان بانگی باوکی بکا : ( بابە ••• ) خۆ دروستیش نییە کەس سەر بەماڵەکەمان دا بکا ، یەکسەر بەراکردن دێتو بەتەنگەتاوەوە دەپرسێ : ( ئەوە باوکمە ؟ ) ••

**مارین :**

هەقیەتی •

**گینا :**

مناڵەکە هەقیەتی ، کەچی من هەقم نییە.! وا نییە ؟ پێم بلێ ، داخوا منیش هەقم نییە ؟ دەی تۆیش مەحکەمەم بکە ، من حاکمم زۆرن •• هەمووشیان نهێنین ، لە چاویانرا دیارە دەترسن ، بەلاّم لەو دیوی زاتی ئەوەیان نییە ، بەرووەروو لە گوڵێم گرانتر پێ بڵێن • کەچی هەموویان پاشملە

پستە پستەیانە : ( ئافرەتێکی خراپە ، ئەو زیرەك بوو ، فریوی‌داو هەڵات •• ) چونکە منیش بڕوام بەو زیرەکی‌یە هەڵخەڵەتێنەرەی هەبوو، ئەوەیان بە کفر زانی •• دەی تۆیش محاکەمەم بکە ، چونکە تۆ یاسایی !

**مارین :**

بەڵام ئەمانە یاسای ترن ، جیاوازن ، تۆ بە خودی خۆن دەبینی تەنانەت ئەم یاسایانەش وەك رەنگ وان بە لەشی حاکمەکانەوە ••• تا زووە یا بڕۆین دەنا درەنگ دادێ ، گەر بەم شێوەیە رێ بکەین شەودادێ خواش دەزانی کەی دەگەینە جێ ؟

**گینا :**

ئەگەر ئیشی تۆ بە رۆیشتن پێك بێ • با بڕۆین ••

**مارین :**

راوەستە ، من لکەدارەکان هەڵدەگرم ، تۆش پەلکەدارەکان بە دەستێك‌و تفەنگەکەیش بە دەستێکی‌تر هەڵبگرە •

**گینا :**

راستی ئەوە تۆی ، یا کەسێکی ترە ؟

**مارین :**

جا بۆچی من نیم ؟ یاسا هەرگیز رێی ئەوە ناگرێ ئەم کۆڵە لەباتی ئافرەتێك هەڵبگرم •• ها بەچی پێدەکەنی ؟

**گینا :**

وای بۆ کەسێ تیلە چاوێکی لێ بوواینایەو بەم جۆرە وێنەیێکی فۆتۆگرافی بگرتباین‌و بۆ دەزگای دارستانی ناردبا •؟!!

- ٢ -

**گینا :**

بوەستە ، چیتر نەرۆی •••

**مارین :**

چی‌یە ؟ ماندوو بووی ؟

**گینا :**

نەوەڵڵا ، بەڵام وتم پشوویێ بدەین •

**مارین :**

گەر هەروا بڕوا هەموو دەقیقەیەك بوەستین ، ئیمشەو لە دارستان دەمێنیتەوە •

**گینا :**

جا ئەوە دەترسێنێ ؟

**مارین :**

ترسی چی ؟!

**گینا :**

دەتوانم گوللەبارانت بکەم •

**مارین :**

دەی بیتەقێنە ! ئەمن تەنهام ، کەسم نی‌یە بۆم بگری ، دارێکی وشکم بۆ پاسەوانی دارستان •

**گینا :**

بەم جۆرە مەئاخفی ، وشکەداریش بایەخی خۆی هەیە •

**مارین :**

چۆن بایاخی هەیە ؟ بۆ کێ ؟

**گینـا :**

بۆ ئەو کەسەی کە خۆی پێ رادەگرێ •

**مارین :**

ئای خۆزگە دەمزانی کە بایەخم هەیە یان نا ؟ داخوا مـن بایەخم بۆ کێیە ؟

**گینـا :**

بپرسە ؟ ( دەڵـێن نەشارەزا بـە پرسـیاران دەگاتە شـاران ) بپرسە ! پرسیار چ خەوش‌و گوناحێکی تێدا نی‌یە •

**مارین :**

زۆر باشە ، ئێستاکە من دەپرسـم : ئایـا تـۆ داری وشـك هەڵاتووت پێویست دەبێ ؟

**گینـا :**

ئاخر ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر چەشنی دارەکە هـەر چەنـدە ئێستاش خۆم بە هیچ دارێك رانەگرتووە •• دارێ ئەوەتا ، بەرچاو وادیارە دارێکی بەهێزو پتەوە ، کەچی کە خۆی پـێ رادەگری قر ۆ •• ر •• چ جیرەی دێ‌و دەشکێت •

داریش هەیە باریـکەلەو لـووس دیـارە بـەلام لەناوەوەدا یەکدیگرو پتەوە • دیسان دار هەیە سووکەڵە دێتە پێشـس چاو ، کەچی کە دەستی بۆ دەبەی لە گرانیا ناچاری بـۆی لار بیەوە • داری تر هەن وەکو بلێی راست‌و پتەون ، کەچی هەر لەگەڵ دەستت بۆ بردن خواردەبنەوەو دەچەمێنەوە وەك ئەڵقەیان لێ دێ •

**مارین :**

ئاخر چەشنی داریش ، دەگەڕێتەوە سەر چەشنی درەختەکەی

**گینـا :**

دەبێ دار نەشکێو نەچەمێتەوە ، نابێ قورس‌و گرێنیگرنـــی بێ •• دار دەبێ تینوویەتی بەرهەتاوی دیبێو پێی پتـــەو بووبێ ، نەك لەژێر گەنی‌و پاشماوەی پرتی پرتی‌دا وشـك بووبێ • گەر بریقەداریش نەبێ گرینگ نی‌یە ، گرینگ ئەوەیە نەبێتە ••• قامچی ••• • بەراستی من لـە قامـچی وەرسم • قەیناکە ئەگەر نەختێ خواریش بێ بەڵام بە مەرجێ ئەو خواریەی بۆ مەبەستێـکی تایبەتی نەبێ ، بە تەگبیر نەبێ ، ئەو کاتە دەتوانم تەنیا بڕوام بەو دارە هەبێ کە خۆی پـــێ رابگرم •

**مارین :**

تەنها بڕوات بەو دارە هەیە ؟

**گینـا :**

بەڵێ •• ئا بەزاست لەبیرم کرد بڵێم ، کە دەبێ داریـــش بزانێ کێ پاڵی پێوە دەدا ؟ چی پێ هــەڵدەگرن ••• ژیـانی مرۆڤایەتی چەشنەهای تێدایە •

**مارین :**

گینا ! تۆ دارێکی تایبەتیت دەوێ ، نە ڕاستبێو نەخوار نــە تەڕ کە بچەمێتەوە ، نە وشکێش کە بشکێو هەڵوەڕێ •• تۆ ئەو دارەت دەوێ کە لە کارگەکاندا لە درەختێ دروست دەکرێ لووس‌و بریقەدار •

گینـا :

من باسی لووسی‌و بریقەم نەکردووە ، گوێم لەو باسانـــە پڕ بوو •• لووس‌و بریقەدار با بەس بێ !

مارین :

ئەو پەلـکە دارانـەم بـدێ قایخێـکی بێ دروسـت دەکەم ، کوڕەکەتی پێ دڵ خۆش بکە حەز لە چ جورە قایخێك دەکا ، چارۆگەدار یاخود هەڵمی مۆتۆردار ؟

گینـا :

هەمیشە بەزاری لاسایی دەنگی مۆتۆر دەکاتەوە •• کـــە قایخێکی بچووك دە دەسشۆرێ یا دە تەشتێ داوێ‌و هەرایێکی دەنێتــەوە مەپرســە وا بزانـم حەزی لـە مۆتـۆردارە نـەك چارۆگەدار ••

مارین :

بێ‌گومان ونە ون بە دەنگی دەکاو وەك قایخی هەڵمیش لەوانەیە فڕەفڕ بکا ، وانی‌یە ؟

گینـا :

با ، بە فڕە فڕو زرەزرو تەقەتەق دەکاتە هەراو دەنگەدەنگ دەڵێم بەو هەراو هۆریایە هەر ئێستا کەللەم دەتەقێ •

مارین :

من بڕوام وایە ئەوەی بیەوێ لەگەڵ چەرخ رێ بکا ، دەبێ بە دەنگە دەنگ‌و هەرابێ •• کوڕەکەت سیسە وانی‌یە ؟

گینـا :

زۆر بزۆزە •• مووی سەری وەك پەڕی باڵندەیە لە هەوادا •

**مارین :**

هەر بزۆزەکانن جیهان دەگۆڕن ، هێمنەکان لە جێی خۆیان نابزوون ••

راگرەیەکم بۆ قایخەکە دیتەوە ، چی نەماوە سوکانو چەنگاڵ نەبێ • ئیتر قایخەکە ئامادە دەبێ •

**گینـا :**

دەتوانم سەفەری پێ بکەم ؟

**مارین :**

بەڵام هێشتا بێ سوکانە !

**گینـا :**

منیش دەمەوێ بە قایخێکی بێ سوکانو بێ پانکەو چەنگاڵەوە سەفەر بکەم ، تا نەزانم بۆ کوێ دەچمو لە چ کەنارێك گیـر دەبم • ئەو کاتە ( با ) جێگای تۆ دەگرێتەوەو لەباتی تۆ قایخەکە بەرێوە دەبا •

**مارین :**

تۆیش لەسەر گازی پشتیو دەڕوانیتە ئاسمان ، شەپۆلەکانیش جۆلانەت پێ دەکەن •

**گینـا :**

ئەمەت لە کوێ زانی ؟

**مارین :**

دەیزانم •

**گینـا :**

پێکەوە •• سەفەر بکەین ؟

**مارین :**

باشە پێکەوە سەفەر دەکەین •

**گینـا :**

بەڵام دەریا دوورە ••

**مارین :**

گرینگ ئەوەیە باڵ کەوی‌و بڕوانیتە ئاسمان ،

**گینـا :**

بەراستی ئێمە لەناو قاپخ‌داین ؟

**مارین :**

تەواو وایە •• ئێمە لەناو قاپخەکە داین ، سەیری ئـەو پـەڵە هەورانە بکە ئەوجار دەبینی •• تەماشاکە لێیان ورد بەرەوە ، راستەو خۆ تێیانەوەرامێنە ، ئەوجار دەبینی کـە ئێمە لەنـاو قاپخەکە داین •

**گینـا :**

ئای خۆ راستە ، ئێمە دەجوولێینەوە •

**مارین :**

بەڵێ ، دەجووڵێینەوە •

**گینـا :**

هێمن •• لەسەرخۆ •

**مارین :**

هێمن‌و لەسەرخۆ •• گوێ گرە ! گوێ بۆ شەپۆلەکان رادێرە•• بزانە چۆن کەوتوونەتە سەما •• گوێت لێیە ؟

**گینـا :**

بەڵێ•• گوێم لێیە•• گوێم لێیە•• ئەو سیرە سیرە چی‌یە ؟ جیرە جیرێ لە جێگایەك دێ •

**مارین :**

وایە ، ئەوە دەنگی سیرەی داری قاپخەکەیە ، درزی داوە •

**گینــا :**

چەندم حەز لێیە نقووم نەبین ، دایکی منداڵێــکم •• دوای ئەوەش تووتن بێ سەرپەرشتکار دەمێنتەوە •• دەزانی تووتن چییە ؟ تووتن زێڕی زەردە •

**مارین :**

تەماشا ، هەورەکە توایەوە ••

**گینــا :**

ئای بەداخەوە ••

**مارین :**

چاوەڕێ هەورێــکی‌تر بکەین ؟

**گینــا :**

نەء بابڕۆین ، سوپاست دەکەم بۆ ئەو گەشــتە خۆشــە • بــا پێــکەوە دارەکان هەڵــگرین ،

**مارین :**

ڕێوبانی دارستان تەنگن ، جێی دووانی تێدا نابێتەوە •

**گینــا :**

هەمیشە واسەفەر دەکەی ؟

**مارین :**

کە هەورێکم دی ، لێی ناگەڕێم تاکو گەشتێــکی پێ نەکەم •

**گینــا :**

تۆ شتێــکت تێدایە !

**مارین :**

چییە ؟

گینـا :

شتێـکی خاکی نی‌یه ، نەخێر مارین تۆ دار نیت ••

مارین :

که وایه من چیم ؟

گینـا :

دار توندە ، بەڵام تۆ شتێـکی ناسکت تێدایه •

مارین :

توند یا ناسك ، بەڵام من لەسەرت هـەر دەنووســم‌و لێشـی دەکۆڵمەوە ، ئەگەر وایش تێ بگەی که ئەمه ناکـەم ، زۆر سـەهوی •

گینـا :

چی ؟ من هیچ بە خەیاڵما نەهاتووه که تۆ واز له داوایـەکەت بێنی •

مارین :

یاسا ، یاسایەو بەرخەتایش پێویستە سزا بدرێ •

گینـا :

گوێت لێ بێ ، باسی خەتا مەکە

مارین :

بۆچی ؟

گینـا :

پێویست ناکا •

مارین :

چاکـە ، وس دەبـم ، بـا بڕۆین تـا جارێـکی‌تـر دەریـا هەڵنەستاوەتەوەو کەف‌و کوڵی نەکردووە •

گینـا :

بووەستە !

مارین :

ئەوە چیتە ؟

گینـا :

با لکەدارەکان هەڵگرین ، دەنا کۆڵەکە بەردەبێتەوەو ....

مارین

ئەو لکانە تەواو قورسن چۆنیان پێ وەستای ؟

گینـا :

دەمو چاوت یەك پارچە ئارەقەیە ، چاولێـك نێ ئارەقـەکەت دەسڕەوە ، پێویستە گوێت بشۆی .. تۆ دەبیەی ؟

مارین :

دەیشۆم .

گینـا :

تووڕە نەبی کە بەسەرمدا قیژاندی .

مارین :

خێر تۆڕە نابم .

گینـا :

تۆ حاڵیبە لێم ، دەتوانی موحاکەمەم بکەیو لەسەرم بنووسی بەڵام پێم مەڵێ تاوانبار ، چونکە من لە هیچ مەسەلەیەك خۆم بە تاوانبار نازانم .

مارین :

ئەگەر ئەوەی دارو درەختـان دەبڕێ تاوانبـار نـەبێ کـێ تاوانبـارە ؟

**گینـا :**

تاوانبار ئەوەیە کە پاڵ بەو کەسەوە دەنێ •

**مارین :**

جا بەڕای تۆ ئەمە کێیە ؟

**گینـا :**

ئەوەی کە بێ دارمان دێڵێـتەوە ، ئیمەشـس پێمـان دەوێ بـۆ تووتنێ •

**مارین :**

جا دەتەوێ لەسەری بنووسم ؟

**گینـا :**

تۆ ؟ تۆ نەء بەڵام گەر من پاسەوانی ئەم دارستانە دەبـووم ، موحاکەمەم دەکردو زیاتریش •• لەسـەریشـم دەنووسـیو نەمدەهێشت گایـکی‌تر چاوی بە رووناکی بکەوێتەوە • کاری من تووتن داچەقاندنە لەبەر ئەوە وازم لێبێنە ئەو لکەدارانـە بەرم • یەك بەباری ئەو بەرپرسیارەش کە وەکو پێویسـتو فەرمانی خـۆی بـەجێ نـاگەێنێو دارمان ناداتـێ • دەبـێ موحاکەمـە بکـرێ ، دەبێ ئەویشـس بانگی بکـاو بەرابـەری هەمووان لێی بپرسێ : « ئەرێ کاکێ تۆ مووچە وەردەگری یان نا ؟ بەڵێ وەری دەگرم • بە ئۆتۆمبیل هاتوو چۆیێ ناکەی؟ بەڵێ بە ئۆتۆمبیل دێو دەچێ • جا ئەدی جەناب بۆچی ژنان ناچار دەکەی وەکو دزان بخووشنە ناو دارستانو لکەداران لە کۆڵێ نێنو بیبەن • » هەر دوور نەڕۆین تۆ چەند کەست بە تاوانی دار بڕین گرتوون • ؟

**مارین :**

به دەیان ، دەیانگرم ، قسەی ناشیرینشیان پێ دەڵێم ، بە توندیش رەفتاریان لەگەڵ دەکەم • ئەوانیش خواهەڵناگرێ لە جنێودانی من قسور ناکەنو بەو جۆرە •••

**گینا :**

گرتنو قسەی ناشیرین سوودی نی یە ، خەڵکی لەگەڵ ئەوەشا دەچنە دارستانو دارانیش هەر دەبڕن • ئەگەر وانەکەن تووتنەکەیان دەرزێ و•• چونکە ئەگەر ئەو لکەدارانە نەبن تووتن وەکو پێویستە وشك نابێتەوە • ماندوو بوونو رەنجکێشانوماڵیشمان کە نرخی تەواو نابێ وەك خۆڵەمێشی دەم رەشەبای لێ دێ •• باشە یاسا بەدوای تاوانباران ناگەڕێ• دەفەرموو ئەوەتا تاوانبارەکان •

**مارین :**

کەس بەم جۆرە موحاکەمەیان ناکا •

**گینا :**

چی دەبێ گەر یەکێك لە ئێوە بڕیار بداو دەستەچڵێك بباو نیشانی بەرپرسیارانی بدا ؟ ، ئەو کاتە هەموو شتێك دەبڕێتەوە •

**مارین :**

مەبەستت لەوەیە من بچم موحاکەمەی ئەوانە بکەم کە دارتان نادەنێ ؟

**گینا :**

تۆ ئەمە ناکەی •• من وەکو خۆم قسە دەکەم کە لە جێی تۆدام کەواتە چاکیان موحاکەمە بکە •• بۆ پێ دەکەنی ؟

**مارين :**

ئەمن دەزانم چ هەرایەك لە دادگادا دەبێ ، شایەدەکان پـۆل پۆل چ دەنگە دەنگـێك پەیدا دەکەن •

**گینـا :**

وایە ، ئەو کاتە لەرەگی مەسەلەکەش پێ دەکەوین •

**مارين :**

بریا دەتزانی چ سزایەکم دەدان •

ناچارم دەکردن ئەو چلاٌنە لە کۆلێ نێن ، بەو گەرمایەش بـە تەواوی ئەو ناوەمدا دەگـێڕان •• داخۆ ئەوە عەدالەت نی‌یە ؟

**گینـا :**

ئەوە هەرگیز نابێ !

**مارين :**

لەوانەیە شتی‌وا بووبێ •

**- ٣ -**

**گینـا :**

ئێستاش سووری لەسەر ئەوەی لەسەرم بنووسی‌و موحاکەمەم بکەی ؟

**مارين :**

لەمن یەدەر کەسی دی ئەو کارەی ناکا ، بەلاٌم نەك لەگەڵ تۆ، لەگەڵ ئەوانەی کە ناچاریان کردووی ئەم کارە بکەی •

**گینا :**

شێت بووی ؟ لەوانەیە گەرما کاری لە مێشکت کردبێ‌و ، کەری کردبی ؟

**مارین :**

تا ئێستا خۆم بە زیخ زانیوە ، بەڵام شتێکم نەکردووە . ئێستا من بە دەبەنگی‌یەوە دەچمە پێش ، بزانم ئەمەیان چی بەرهەم دێنێ . ؟

**گینا :**

دەتوانم پێت بڵێم چی بەرهەم دێنێ . سەرۆکی کۆمەڵە کارکەنارت دەکاو دەتنێرێتەوە دێ میگەلی پەرت کۆبکەیەوە خووری لە هەوادا هەڵبێخی .

**مارین :**

چەندەها دەرزیام لە ناخی‌دا هەڵدەچن .

**گینا :**

خودایە ، بەراستی شێت بووم ، دەزانی تۆ دەبەرچی‌دای بیکەی ؟

**مارین :**

دەزانم ، خۆم بەدەرکردن دەدەم .

**گینا :**

گوێت لێ بێ ، ئەمن گاڵتەم دەکرد .

**مارین :**

گاڵتە دەکەی ، چ دەکەی ، کەیفی خۆتە ، کێ ، رێگەت لێ دەگرێ ؟

**گینـا :**

لە پێناوی من ئەمە دەکەی ؟

**مارین :**

نەخێر لە پێناوی خۆم ، گوێگرە ! جارێ پێشەکی لەسەر تـۆ دەنووسـم راتدەکـێشـمە دادگـاو لەگەڵـێشـتـدێم ، ئـەو لکەدارانەش لەگەڵ خۆم دەبـەم ، تا هەموو کار بەدەسـتان کۆبکەمەوە •

**گینـا :**

پێکە ! ئەوەی داتناوە بیکەی بیکە ! یاڵڵا با بڕۆین •

**مارین :**

تۆ پەلەتە ؟

**گینـا :**

نەخێر •• تووتنەکە سەعاتێـکی دیش چاوەڕێ دەبێ •

**مارین :**

تۆ تەنها بیر لە تووتن دەکەیەوە •• منیشـت لەم مەسـەلەیە هاوێت •• بەسە باسی تووتن • بیبڕەوە !

**گینـا :**

تۆش هەر لەسەر موحاکەمەو لێکۆلینەوەو دادگای خۆتدابە• تۆش بایەخ بە هیچ نادەی ، موحاکەمە نەبێ •

**مارین :**

من •• نەخێر ••

**گینـا :**

ئەتۆ چیدیت لەلا بـە بایەخـە ؟ تـۆ دارنی تۆ قامچییـەکی ئەستووری !

**مارین :**

ئەقڵم لەسەریدا نەماوە •

**گینـا :**

تەماشای من بکە ، ئەقڵت دێتەوە سەری •

**مارین :**

دەچاو ڕامان پێویستە •• بەڵام ناو چاو •• بیلبیلەکـەی ••
ئەوێ ••••••

**گینـا :**

ئەوێ ، وەکو بڵێی دەریای تێ ڕژاوە ••

**مارین :**

وادیارە هی تریش ئەم جۆرە قسانەیان لەگەڵ کردووی ؟

**گینـا :**

ئەی تۆ لەو باوەڕە دای تاکو ئێستا کە ئەوە تەنم ( ٣٥ ) ساڵە
چاوەڕوانی ئەم قسانەم کردبێ ؟ ئای کە ساویلکەو منالی ••
هەموو شیعرێك باسی ئەمە دەکا •

**مارین :**

من باسی دەریام نەکردووە ، باسی بیلبیلەی چاوم کردووە کە
هەموو شتێـکی تێدا ناسكو تروسکەدارە •

**گینـا :**

تروسکەدار ؟ ئەی‌ئەگەر ئەو تروسکەیە سووتاندتی ؟

**مارین :**

با بم سووتێنێ •

**گینا :**

دەزانی چی تۆم بە دڵە ؟ تۆ پیاوی بەڵام وەکو منداڵ شەرمنی ..
ئێستا چی بکەین ؟ با گەشتێکی‌تر بە قایخەکە بکەین .

**مارین :**

دەی .

**گینا :**

سەیری من مەکە ! تەماشای هەور بکە . گەشتەکەمان دەستی پێ‌کرد؟ لەوەتەی هەم بۆ ئەوەی هەم کە تۆ بێ‌ی‌و ئەم قسانەم پێ بڵێ‌ی .

**مارین :**

ئا .. ئێستا ئێمە بەسەفەر دەچین .

**گینا :**

گوێت لە دەنگی شەپۆلەکانە ؟

**مارین :**

گوێم لێ‌یە .

**گینا :**

ئەدی ئەو سیرەسیرە چی‌یە ؟

**مارین :**

ئەوە سیرەی داری قایخەکەیە .

**گینا :**

ئای چەند حەز دەکەم نقوم نەبین .

**مارین :**

مەترسە ، ئێمە پێکەوەین •

**گینا :**

شتێکم لەبن سەری دابنێ •

**مارین :**

چــی ؟

**گینا :**

چی ؟ دەستت پێوە نین ؟

**مارین :**

یەکیان یا هەردووکی •

**گینا :**

هەردووکیان •• بەخوا منالی مارین •

ـ تەواوبوو ـ

# فەرهەنگۆك

من بەخۆم ئەوەندە بەینم لەگەڵ فەرهەنگۆك ڕێکخستن نییە ، کە ئێستا بووە بە باوو لە پاشکۆی کۆمەڵە چیرۆك‌و شیعران دەیانبینین ، چونکە پێم وایە ئەوەی بە زمانێك دەخوێنێتەوە پێویستە ئەو زمانە بزانێ ئەوجار پێی بخوێنێتەوە •

دیسان فەرهەنگۆك دانان بۆ کتێبێکی زمان یا فەلسەفە یا هەر کتێبێکی دیکەی لەم بابەتانە کە دەشێ ئیدیوم‌و وشەی نوێی تێ بکەوی ، بە هەر جوور ! بەڵام بۆ چیرۆك‌و شیعر ، ئەوەندە بە پێویستی نازانم •• سوێندی ئەوە ناخۆم ( بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە ) دەبینی وەرگێڕ لە ناوێك هەڵدەنگوێ کە لەوانەیە بە خوێنەری ئەو زمانەی بۆی وەردەگێڕرێ ئاشنا نەبن ، ئەو دەمە لەوانەیە ڕوون‌کردنەوەی بێ‌سوود نەبێ • لەگەڵ ئەوەشدا گەلێك لە برادەران کە وا ڕێك کەوتووە لەم مەسەلەیە دواوین فەرهەنگۆکیان پێ شتێکی چاك بووە •

هەرچی چۆنێکە ، من لە لایەنی دەربڕینەوە ، زمانی کوردی بە زمانێکی مەیدان کورت نابینم •• لەگەڵ ئەو بارو زروفە سەخت‌و تایبەتیەشیدا لەچاو زۆربەی زمانی ئەو

ولاتانەی کە هاوسێی کوردنو هەموو پێداویستی پێشکەوتنیان بۆ رەخساوە ، زمانی کوردی خۆڕاگرترو فەرهەنگ پاگژتر دێتە بەر چاو ...

بەم جۆرە ئەم وشانەی لە خوارەوە دەیانووسمەوە بە مەبەستی فەرهەنگۆکەوە نی‌یە زیاتر لە ترسی ئەوەی کە نەبادا هەندێ لەم وشانە خۆێنەر بۆ مانایەکی دیکە ببا کە لە ماناو رووداوی ناو چیرۆکەکانەوە بترازێن . لەگەڵ تێبینی ئەوەیش کە لە ریز کردنی ئەم وشانەدا پەیرەوی ( ئەلف و بێ ) نەکراوە ، بەڵکو یەك بە دوای یەك ، رەمەکی ، ریز کراون .

– وەرگێڕ –

رمن ، ناچنە جەواڵ : کینایەتە بۆ کەسانێ سەر دانانوێنن .

رەپێ بوو : هەستایە سەرپێ ، را بوو .

خیز : زیخ ، لم .

خانەنشین : تەقاویت .

خاتوون سێمانکە : پەپوو سلێمان .

بن بێژینگ : بنەرۆك ، ئەو دانەی کە لە بێژینگێ دێتە خوارێ .

بیرەخەو : بۆرژان ، وەنەوز ، پشی‌یەخەو ، وێژینگ •

بانگلۆز بووەوە : خلۆر بووەوە •

بەساتی : بەپەلە ، خێرا •

بچمە یاری : بچم یارمەتی بدەم ، کۆمەك کردن •

سەرەکۆزەر : ئەو پووش‌و بیژۆکەی لە بێژینگێ ناچێ •

سابرێن : نێری بزن •

دەستەبرا : هاوڕێ ، برادەر ،

دارعەنە : چوار چیوەی تەون ، ئەو دارەی پەڕەکەڕ پەمۆی بەناودا دەبا •

دەرمانی یەك‌ساتە : دەرمانی دەم‌و دەست •

دەبیەی : دەبیسی •

دیق دیقانێ : سەرتاتکێ •

دەبنیسمێ : لەڕو لاواز دەبێ ، رەنگ زەردو بێ‌تووك دەبێ •

کاکەلە براله : کەین‌و بەین ، رێککەوتن •

کەل‌و پەلی کرد : پارچە پارچەی کرد ، لە باڵ یەکدی دەرهێنا •

کوور : بزنی ساڵە وەخت •

کاکەغە : ( کاك ئاغا ) ، لە چیرۆکەکەدا مەبەستی لە کابرای زاوایە •

کسۆك : سەگ •

کێل بووەوە : قیت بووەوە ، هەستایەوە •

کردار : دەغـڵ •

گۆرین : هەمان ، گورگی گۆرین : هەمان گورگ •

گجوولە : توولەی سەگ •

گول : گڕوێ •

گاڵەیدا : کلیلیدا ، دایخست •

گڕنیگڕنی : گرنج گرنج •

تاپڕ : تفەنگی راو ، ساچمە •

تیزماڵ تیزماڵ : داو داو •

تێکسمڕاو : تێك چەقیو •

تریان : قۆلینە •

هەندی لەنێبێ : یەکسەر ، دەمو دەست •

ژۆر : ژووروو

زرۆبی : ناوساجی ، ناوسێل ،

زەوەززە :   وەچە •

پێی وەستا :   دەرەقەتی هات ، هێزی پێ شکا •

پێچۆڵ :   ران ، مێگەل ، ولسات •

حەلووکە :   هەڵوژە •

فێقی :   میوە ، تەڕە •

شووڵ :   شواڕک •

شۆرەت :   ناوبانگ •

شویتك :   پشتدێن •

شایەدنامە :   شەهادەی خوێندن •

پەیتوون :   ئەو عەرەبانەی هەسب رایدەکێشێ •

داپچکوڕان :   بزڕکان •

بە ئەزرەتم : خۆزگەی بۆ دەخوازم •

زیخ :   زیرەك :

قەڵێ :   قاورمە •

نابەرویك :   شێواو •

مۆنجی داگرت :   زیز بوو •

سەرکەڵ :   سەرلق ( لق و پۆپی درەخت ) •

له نۆژەنەوە : له بناغەوە .

لیڤ : پارەی بولغارەکانە .

کۆلیت : کۆخ .

بێ تووك : رەنگ زەرد .

سێرە : نیشانە .

تفنك : دفن ، لووت .

زەروو : کرمی زەروو .

کورنیشك : لۆچ .

له دوو : بە دوای .

پریشکی دەهاوێت : دەربڕینێکە بۆ کەسێ کە تووڕە دەبێ .

دەپەیڤی : دەئاخڤی ، قسەی دەکرد .

کەلەواژبوونەوە : سەرنگوون بوون ، راقەنان .

پەلە کووتە : پەلەقاژە .

# سەرچاوەکان

ئەم چیرۆکانە لە سێ سەرچاوە وەرگیراون ، کە ئەمانەی خوارەوەن :

١ ـ چیرۆکی : ( کاتیرین ، درەختێکی بێرەگ ، رۆژگاری پیاوان ، زەوەززەی دەروێش ) •
بۆ ئەم چیرۆکانەی سەرەوە ، بڕوانە ژمارە ـ ٢ ـ ی ساڵی دووەمی گۆڤاری ( الاداب الاجنبیة ) کە لە شامێ دەردەچێ •
بڕوانە ـ ل ٢٨ ••• ( بەزمانی عارەبی ) •

٢ ـ رێگاوبان : بۆ ئەم چیرۆکە بڕوانە / ماهنامەء کاوە / ژمارە (٣١) لاپەرە ـ ٣٣٥ ـ ( بە زمانی فارسی ) •

٣ ـ قایخێك لە دارستاندا : ئەم شانۆیی یە لە ژمارە (١٢)ی گۆڤاری ( الاقلام ) ساڵی ٩٧٦ هونەرمەند قاسم محمد کردوویە بە عارەبی •

## ناوەڕۆك

7

[ بەرهەمەکانی خاتیـۆف ئاوێنـەی
بێ گەردن ، وێنـەی ژیـانو گوزەرانی
خەڵکی سادەو دڵپاکی وڵاتەکەی تێـدا
رەنگ دەداتەوە ، ئەوانەی کـە لەگەڵ
سادەیشیاندا لەبەرابـەر چارەنووسێکی
نادیاردان ‧‧ چونکە هەرگیز فێر نەبوونو
ناتوانن سەرچاوەی سۆزو خۆشەویستیان
بگـرن ‧‧‧‧ منـاڵی ئـەم سرووشـتە
بەربەرەڵایـەن ، وێنـەی ئـەو رەگەو
ریشانەن کە خاتیۆف لەم چیرۆکانەیدا
باسیان دەکا ‧‧ چوونەتە قوڵایی خاکو
لەگـەڵ سـرووشتی پاکدا تێکەڵ بـوون،
مرۆڤی چاونەترسو سەربەرزن ، رمنو
ناچنە جەوال ‧‧ هەمیشە خەنجەریان
لەبەر پشتێدایە ، بەڵام زاڵم نینو زوڵم
ناکەن، لەلای ئەوان ئازایەتی سەرپشکی
هەموو شتێکە ‧‧ ( ئازایەتی ) بە هەموو
مانایێ کە ئەم وشەیە هەڵی دەگرێ ،
هەر بۆیەشە کە دەڵێن :

« لەوانەیە هەرچی چاکەیە ئـەوە
بکەی ، بەڵام تۆ دەترسی ، کەواتە تـۆ
زەلیلی ، تا دونیاش مـاوە بـە زەلیلی
دەمێنیەوە ‧ ]

*ROADS*

..REGA W BAN..

A COLLECTION OF SHORT STORIES

BY:

NICHOLAY KHAITOV

TRANSLATED INTO KURDISH

BY:

NAZHAD AZIZ SURMÉ

BAGHDAD 1983

چاپخانەی ( الحوادث )